

# فەرهەنگی وشە دووانەکانی زمانی کوردی






تاها فەیزی زادە

# ەرهەنگی
# شە دووانەکانی
# زمانی کوردی



نەرم و نۆڵ

□ تاها فەیزی زادە

**ناوی کتێب :** فەرهەنگی وشە دووانەکانی زمانی کوردی

**نووسەر:** تاها فەیزی زادە ٠

**بڵاوکەرەوە :** ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی
( انتشاراتِ صلاح‌الدین ایوبی )

**تیراژ :** ٣٠٠٠

**چاپی یەکەم :** ١٣٦٧

**نەخشینەری رووبەرگ :** جەعفەر قازی

سەرەتا لە لایەن دانەرەوە :

سپاس بۆ خوا کە بۆ یەکەمجار لەئەدەبی دنیادا قامووسێکی سەربەخۆ وتایبەتی لە ناوی دوانە (اتباع)و زاراوە (مصطلح) پێک دێ وئەو قامووسە هەڵکەوتوو (مکشوف)وەش لەزمان و ئەدەبی کوردی، سەرهەڵدەدا .من لەمێژە لە ناوەدوانە و زاراوەکانی گشت زمانان وبە تایبەت شێوە (لەهجە)ی موکریم وەک : لەدەست وبووکەوتن، چاووچڕ بەسەر شتێک داگرتن ، شەکەت وکەلەلا بوون، ئاڵ وگۆڕکردن ، ئاڵ وبۆڵ بوون ، ئەوڕۆ سبەینێ بەیەکێک کردن ، پەلپ وبیانوو بەیەکێک گرتن ، بارگەوبنە تێک نان ، نوێن وبان راخستن ، برسی وتینوو بوون ، بڕو بیانووهێنانەوە، بەبنج وبناوانی شتێک دا چوونە خوارو بەدڵ وداو شتێک کردن ...

وبەرامبەر (معادل Equivalent)ەکانی ئەوانە لە زمانی تردا ، کۆڵیوەتەوە وبۆم دەرکەوتووە کە نەک هەر لەزمان وئەدەبی کوردی دا بەڵکوو لەزمان و ئەدەبی فارسی و عەرەبی وتورکیش دا تا ئێستێ قامووسێکی سەربەخۆو وتایبەتی ئاخندراو لەم وشەدوانانە (اتباع) و زاراوانە (مصطلحات) پێک نەهاتووە.

هەیاران بۆدەبێ پێک نەهاتبن ؟ ئەوانەلەقسەکردن دا

زۆر بەسەر زار و زمانانەوەن و شاعیر ونووسەر بۆ ڕەنگین کردنی ئاسەوار و سەنگین کردنی شوێنەواریان ، تا توانیویانە کەلکیان لێ وەرگرتوون وتێکەڵاوی بیرو هەستی حەشیمەتن ولە ئاست مێژووی وێژە (تاریخ ادبیات) ـ یش را ڕەسەنن ودروشمی نەتەوایەتیان پێوەیە.

بەڵێ، کوت کوت و پچڕ پچڕ ئەوانەم لەنێو ئەم کتێب و گۆوارانەی خوارەوەدا دیون :

" ئا ـ بەزمانی کوردی:"

١ـ قامووسی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم ودووەم ، ١٩٧٧ ، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ، مامۆستا زەبیحی .

٢ـ دیوانی پیرەمێرد، ١٩٧٠ ، چاپخانەی العانی، بەغدا محمدرسوول (هاوار).

٣ـ دیوانی نالی، ١٣٦٤، چاپ دوم، انتشارات صلاح الدین ایوبی، ارومیە.

٤ـ چیرۆکی کوێرەوەری، چاپخانەی النجاح، بەغدا ، ١٩٥٩ ئیبراهیم ئەحمەد .

٥ـ چیرۆکی دمدم، ١٩٧٥ ، کۆڕی زانیاری کورد ،بەغدا وەرگێڕ: شوکور مستەفا .

٦ـ دیوانی گۆران ، ١٩٧١ ، چاپخانەی کامەران،سولەیمانی عمرعبدالرحمن .

٧ـ تاریک وروون ، ١٣٦٠ ، چاپەمەنی سەیدیان مەهاباد، هێمن .

٨ـ نالەی جودایی، ١٩٧٩ ، چاپخانەی علاء ، بەغدا ، هێمن .

٩ـ هەواری خاڵی ، ١٩٧٩ ، چاپخانەی الحوادث ،بەغدا هێمن .

١٠ـ بۆ کوردستان ، ١٣٥٨ ، چاپخانەی جەواهیری، تاران هەژار .

١١- مەم‌وزینی خانی ، ١٩٦٠، چاپخانەی النجاح ، بەغدا
هەژار .
١٢- خەیاسی‌کوردی ، ١٩٦٨، چاپخانەی النجاح ، بەغدا
هەژار .
١٣- دیوانی عارفی رەبانی ، شیخ احمدجزیری ، ١٣٦١ ،
شەرح کراوی هەژار، سروش ، تاران .
١٤- شوێنەوارەکانی سیف القضات ، گردەوەکۆیی قازی
ئەحمەد .
١٥- بەرهەمەکانی سوارەی ئیلخانی زادە
١٦- پێکەنینی گەدا ، ١٣٥٨ ، حەسەن قزلّجی،تاران .
١٧- رێنووسی چۆنیەتی نووسینی کوردی،١٩٦٩،چاپخانەی
شمال ، کەرکووک ، طاهرصادق .
١٨- رێزمانی کوردی،١٩٧٦ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری
کورد ، بەغدا ، ئاورەحمانی حاجی مارف .
١٩- دیوانی حاجی قادری کۆیی چاپخانەی کۆڕی زانیاری
کورد ، هەولێر ، ئاورەحمانی حاجی مارف .
٢٠- ئاسەوارەکانی مەلا محەممەدی کۆیی .

" ب - بەزمانی فارسی "

١- لغت نامه دهخدا ، دهخدا .
٢- فرهنگ معین ، دکتر محمد معین .
٣- برهان قاطع ، محمدحسین بن خلف تبریزی متخلص
به برهان ، سعیدی پور .
٤- فرهنگ مترادفات ١٣٤٣، چاپخانەی پیروز، تهران
محمدپاشا، متخلص به شاد .
٥- کلیه آثار سیدمحمدعلی جمال زاده .
٦- مجله یغما، شهریورماه ، ١٣٤٢ ، سال شانزدهم
٧- مجله یغما ، آبانماه ١٣٤٢ .

پ - بەزمانی عەرەبی "

١ـ كشاف اصطلاحات الفنون،چاپ اول ، استانبول ....
٢ـ آثار ابن فارس .
٣ـ غريب الحديث ، ابوعبيد .
٤ـ اقرب الموارد .
٥ـ شرح منهاج البيضاوى ، السبكى .
٦ـ المزهر ، سيوطى ، مجلدالاول .
٧ـ تذكره الشيخ تاج الدين بن مكتوم .
٨ـ صحاح جوهرى .
٩ـ آثار ميدانى .
١٠ـ نهج الادب ،نجم الغنى خان .

" ت ـ بەزمانی ئنگلیسی "

Kurdish-English— Dictionary, by;
Toufiq Wahby,and C.J,Edmonds
Oxford 1966

" ج ـ بەزمانی فەرانسەوی "

Dictionnaire Kurde - Francais. par Auguste - Jaba
St- Peters bourg 1879

ئەم کتێبەکراوەتەدوو بەش : قامووسی ناوەدوانەکانی کوردی ، رچەشکاندنێک بۆقاموسێکی زاراوەیی،لەوبەشەدا بۆ وێنەچاوگ (مصدر)ی چوون وناویدەست م بەرچاو خستووە و زۆر لکم لێ کردوونەوە .
من ئەو جووتەناو (اسم)انەم کە بەدوای یەک دادێن وەک : سپی وسۆڵ،گاوگۆل،نوێن وبان،...بەدوانە (١)ناوبردوون. لەبەر ئەوەی کە وەکوو منداڵی دوانە بە دوای یەک

---

١ـ تاهیرسادق لەکتێبی "رێنووسی:چۆنیەتی نووسینی کوردی چاپخانەی شمال ١٩٦٩،کەرکووک ،ل١٣٤ـ١٣٦دا بەجووتەوشە ناوی بردوون ودوکتۆرشاورەحمانی حاجی مارف لە کتێبی رێزمانی کوردی ،بەرگی یەکەم ،مۆرفۆلۆژی ،ناو ، چاپخانەی

دوانە، بەدوای یەکدا لەزگی نەتەوە،بەربوونەوەوهاتوونە دنیا(١) ئەم ناوەدوانانە بەهۆی پیتی (و)تێک خراون . لەروانگەی (علم نحو،علم النحو)ەوە بەناوی پێشوودەڵێین : **تێک خەر** (متبوع) وبەناوی پاشوو دەڵێین : **تێکخراو** ( تابع یا الاحق) .

بێتوو ناوی پێشوو و پاشوو واتا ( )ی سەربەخۆیان بێ وبزاندرێن بەچی دەکوترێن بەدوانەکەی دەڵێین :**تێک خراوەی رێک (ترکیب عطفی)**. وەک : بۆن وبەرامە،رێک وپێک ، بەروپشت .کە لە هەر سێکیاندا تێکخەر(متبوع) و تێکخراو(تابع یا لاحق) واتای تایبەتی خۆیان هەیە و لێکیشیان هەڵوەشێنین هەریەکە **مانایەکی** سەربەخۆ دەبەخشن .

بێتوو تێکخراو (تابع) بێ واتا بێ یا واتای هەبێ بەڵام واتای تێکخەر (متبوع) نەگرێتەوە پێی دەڵێین : **تێکخراوەوەی نارێک** (٢) (اتباع) وەک : گیا وگۆڵ (٣) رێکاوبان ، ژەنگ وژوار ....

---

بقیەپاورقی ص قبل:کۆری زانیاری کورد،بەغدا ،١٩٧٦،ل،٣٦٠دا ، بەچەشنێک **ناوی لێکدراو**،رایگەیاندوون.١ـ عومریان درێژ بێ وبەدایک وباب بن وبەهەتیوی بەخێو نەکرێن و خودا ئاگاداریان بێ.٢ـ زوربەی ناوەدوانەکانی ئەمقاموسە لەم تێکخراوەوەن (اتباع).پێوەم خوایاربێ لەداهاتوودا ناوە دوانەکانی کە تێکخراوەوەی رێک **(ترکیب عطفی)** پێک دەهێنن لەقاموسێکی سەربەخۆدا چاپ وپێشکەش بکەم.٣ـ لە تێکخراوەوەی : گیاوگۆڵ دا ناوی **گۆڵ** ،واتای نیە. لە بەرئەوەی کەگۆڵ واتای گیا ناگرێتەوە ونالێکە.کەوابوو **تێکخراوەوەکەمان** نارێکە.بەڵام لەناوی دوانەی دێڵ وگۆڵ دا ، گۆڵ واتای دێل دەگرێتەوەوتێکخراوەوەی رێک وپێک دەهێنێ .

هەروەکوو کوتمان : تێکخەر(متبوع) دەبێ ناوی پێشوو وتێکخراو (تابع) دەبێ ناوی پاشوو بێ .بەڵام هێندێک جار لە تێکخراوەوەی نارێک (اتباع)دا تێکخراو گێرە شێوێنی وجێ گۆرکێ دەکا . وەک : زر و زبیل ، زر و زەنگیانە ، خەلە وخەرمان، مت ومور .و...

هێندێک جاریش ناوێکی کەبە پیتی (م)[1]دەست پێ نەکرابێ ،دەکەینە تێکخەر(متبوع) ودوای دانانی(و) یەک و(م ) یەک ،هەر بەکێش وەزن)ی تێکخەر وشەیەکی ساز دەکەین ولەجێی تێکخراو(تابع) دایدەنێین کە پێیان دەڵێین : زرِرە تێکخەر(٢) و زرِرە تێکخراو(مهمل) وەک : باران وماران ، بەفرومەفر، کتێب ومتێب ...

لەبەر ئەوەی کە لەو چەشنە ناوەدوانانە دەکرێ زۆر تێکخراوەوە ساز بکرێن وئەم قامووسە زۆر ئەستوور دەبوو، لە قامووسەکەم نەخستوون وجێیەکم نەداونێ . چاک وایە بۆ زانینی داب وشوێنی ئەو ناوەدوانانە زمانی عەرەبی وفارسیش بەسەر کەینەوە تابتوانین لەو لایەنیەوە ئەم سێ زمانانە بەراوەرد کەین وپێکیان هەڵکێشین : لە زمانی عەرەبی دا تێکخەر وتێکخراو بێ ئەوەی (و)یان لەنێوان دابێ بەدوای یەکتردا دێن .

---

١- بێتوو بمانەوێ تێکخراوەیەک بۆ تێکخەرێک کەبە (م) دەست پێ کراوە ساز کەین ،دەبێ "پ" ی بە پێش وشەیەکی بخەین وهەر بەکێشی تێکخەر ناوێک دارِێژین وەک : مارو پار، مشک وپشک . ٢- ئەم زاراوانەم راستەوخۆ:خاسەکەووزرِەکەو، باڵندە، ومەندی وزرِە مەندێی گیا وەرگرتووە.بەپێی ئەوە:ناوەدوانەکانی تێکخراوەوەی ، رێک و نارێک ، بە تێکرِایی دەبنە خاسە تێکخراوەوەی رێک و نارێک .

وەک : **عطشان ، نطشان** (تونیایەتی وداماوی). **ساغ لاغب** (برسی وبێ هێز) **خراب یباب** (ورت وویران). بەڵام لەزمانی فارسی دا (١) ناوەدوانەکان وەک زمانی کوردی دەچن .

دەکارکردنی ئەو **ناوەدوانانە** قسەی پاراوتروگفتی دڵگرتر دەکا ،چیمەنی هۆنراوە وپەخشان (نثر) دەخەملێنێ و کۆرپەی ساوای دڵ رادەژێنێ،هەستی خەواڵووزادەپەڕێنێ بڕواننە ئەم **قەڵتە** پەخشانەی خوارەوە کەپروقەلاّ پەچن لەناوی دوانەیە :

"... لەبەرخۆمەوە دەڵێم: خۆزگە وهەزارخۆزگە ،منیش وا پیرو کەنەفت وشەکەت وکەلەلا نەدەبووم وئەوەندەم هێز وگوڕ وتین وتوانا دەما ، تا پڕ بەئامێزم لەو چیرۆکانە هەڵگرتبا وبەهەموو شارو دێ وکوچەوکۆڵانی (٢) کوردستان دا گەڕابام..."

ئەگەر بێنین تێکخراوی هەرکام لەمناوەدوانانە لەم **پەخشانەدا** هەڵاوێرین وای لێ دێ:"... لەبەرخۆمەوە دەڵێم: خۆزگە واپیر نەدەبووم وئەوەندەم هێز دەما ، تا پڕ بەئامێزم لەو چیرۆکانە هەڵگرتبا وبەهەموو شاری کوردستاندا گەڕابام..."

دیارە ئەم **قەڵتەی** ئێستێ وەدەستمان کەوتووە و

---

١- هیندێک لەناوەدوانەکانی فارسی(اتباع)ئەمانەن : ازوچز، اهن وتلب ، باروبندیل ،باستار وبیستار، بک و لک ، جادووجنبل ، جروبحث ،خوش وبش ، ساخت و باخت ،فلان وبهمان،قر واداء کوەوکمر،کروفر، لت وپار.

٢- سەرەتای چیرۆکی "پێکەنینی گەدا" مامۆستا حەسەن قزڵجی ،چاپی دووهەم، ١٣٥٨ ، ل ، ٤ لە لایەن مامۆستا هێمن .

هەڵمانکوشیوە بۆ پێزتر لە قەڵتەکەی سەرەوەیە .لــــەم قامووسەدا هەر ئەو ناوەدوانانەم هێناون کەسەرۆشێـوەی موکرین . بۆلای ناوەدوانەی شێوەی بادینی و هەورامی وبن لەهجەکانیان نەچووم. ئەم قامووسە ئەوناوەدوانانە دەگرێ کە زوربەی خەڵک وحەشیمەت دەکاری دێنن وبەسەر زارو زمانانەوەن . جا چ لەزمانی عەرەبی (١) وفارسی (٢) وتورکی (٣) وەرگیرا بن وچ لەزمانێکی تر(٤) یا لە بنەڕەت وڕاستەوخۆی کوردی رەسەن بن.ئەو ووشانە لەسەر ئەوەش را کەلاوەکین وبە سمر،سمر خۆیان هاویشتوەتە نێو زمانی کوردی وخۆیان مەلاس داوە، زۆرلەمێژە لەنێو ئەم زمانانەدا ماونەتەوە وئیتر بە خۆماڵی دەناسرێن .

من ئەم ناوەدوانانەم بەپێی ئەلف وبێ رێکی یەکتر کردوون ویەک بەدوای یەکدا رێچکەم پێ بەستوون. بۆ ئەوە پتر بزانرێ چون ناوە دوانە وزاراوە دەکار دەکرێن یا لەنێو گفتێکی پێشینیاندا ، هۆنـراوەی شاعیرێکدا ،قەڵتە پەخشانی نووسەرێکدا بەسەرچاوە (منبع) (ماخذ)وە، نیشانم داون (شاهد) .

خاووخێزانی بنەماڵەی خۆم وئەییووبیان زۆربەتێرادیوی

---

١- وەک : بەتاڵ وحەتاڵ = بطال وعطال ،قەزاوقەدەر قضا وقدر. ٢- وەک : هەست ونیست = هست ونیست ،دار ونەدا= داروندار. ٣- وەک : ئاڵ و ویر ، ئاڵ و گۆڕ. ٤- لە: بەروسەماوەردا ، سەماوەر- لە: زیپک و زاکوون دا - زاکوون رووسین . هەروەها لە زمانی - تریشەوە را هاتوون . لێکۆڵینەوەیان بۆخۆی کتێبێکی پێک دەهێنێ .

بۆپێک هێنانی ئەو **قامووسە** بەگەورە وچکۆلەوە هاوکاریـــان کردم: دەتدی هەریەکە کوتەکاغەزێکی بەدەستەوەیە و لە قوژبنێکی دا لەم ناوەدوانانە وزاراوانە خەفتاوە ولـــە گەڵ خۆی قسان دەکا وقسەکان دەنووسی .یا هەمـــوویـان لەمیوانێکی داوەروکاتوون.وەقسەی دەخەن .تائەگەر یـــەک **دوو ناوی دوانە وزاراوەی** بەسەر زاردا هات لەپرێـــک بیقۆزنەوە.

زۆرجار میوان دردۆنگ بووە وکوتوویەتی:بەقوربانتان بم، چم‌کوتووە کە دەی نووسن ؟ دەستی منو داوێن بـێ بێتوو بە هەڵە چووبم پێم بڵێین تانەچمەوە سەری !

لەسەر ئەوەش‌را کە ئەم قامووسە لەزمان وئەدەبـی چوار قورنەی دنـیادا **تاقانە** وتازە**هەڵکەوتوو** (مکشـوف)ە زۆر ناوەدوانە **وزاراوەی** تێدا نییە ونەیگرتووە کـــە دەبوایە تێی دا با و بی گرتبا .کەوابوو ناڵێم: ئـــەو قامووسە "دۆڵارە لەنێو لیران، مانگە لەنێو ئەستێـــران سەرتوپە، لە موکریان. بەڵکوو دەڵێم : قامووسێکـــــی ناتەواوە لەو نێو نێوانە وقاپووچکێکە بۆ ئەم چەشنە پێوانە. لاوێچێکە لەبارێک و کولانێکە لەشارێک .قولـــە گیایەکە لە باقەیەک وجێگا ئیستیکانێکە لە تاقەیەک .

بەهیوام زۆر زوو چەند کەسێک بەوەکۆ کردنـــــی کەرەستە ودەستکەوتێکی زانستی بەربلاو وبەتێوە چـوون و لەخۆرادیوی وخۆتێهەڵقـوتاندنێکی شیاو هەر بەمرێیەی دا، برۆن کەمن کێشاومە، وەشوێن ئەم شتە بکەون کە مـــن وەدوای کەوتووم، ئەو دابە رەچاو کەن کەمن دامخستووە خوایاربێ و ورە لەکار بێ لەزمان وئەدەبی **فـارسـی**، **عەرەبی، تورکی** ، وشێوە (لەهجە)کانی **بادینی وهەورامیش‌دا** لەگوێن ئەم‌شوێنەوارە قامووسی ناوەدوانە و زاراوە ، بیهێننە دی (کشف)وکەلێنێکی پێ پڕکەنەوە وزانستـــــی دنیا پلەیەک وەپێش خەن .

# پیتی (ئا)

**ئابڕوو و شەرەف** :کەسێکی بە هیچ نەچێ وپەکی بە هیچ نەکەوێ ولەنێو خەڵکی سووک و چرووک ونا ماقوول بێ ،ئابڕووو شەرەفی دەچی .

**ئاتاج وموحتاج** : (برسی) ئاتاج و موحتاج کەسێکە کە زۆر پێداویستی بە شتهەبێ و زەوادی خودا شک نەبا .

**ئاجووج وماجووج** : (بێ سەرەو بەرە) دەڵێن پێش دنیا خرابوون جۆرە گیانلەبەرێک بە چوار قورنەی دنیادا بڵاو دەبێتەوە ،ئەوەی پێی خۆش بێ دەیکا ولە هیچ ناپرینگێتەوە .

**ئاخروئۆخر** : (بەرەبەری تەواوبوون) لە ئاخرو ئۆخری هاویندا ،جاروبار هەڵدەکاتە باو تەپوتۆز بڵیند دەبێ .

**ئاخرو عاقیبەتی** : (لەئاکامدا) ئاخری وعاقیبەتی قسەی خۆی سەردە سەر ،هەرچی پێیان گوت نەی سەلماند ونەچوو لە گوێ بەوە .

**ئاخ وداخ** : (پەژارە)

وان بێلە بە ئاخ وداخونالاێ
با بێینەوە سەیری چاوکەژالاێ
"مەم وزینی خانی :هەژار"
لەیلا کۆچی کردرووی کردەلەیلاخ
بۆ تۆ حەسرەتوبۆمن ئاخ وداخ
"پیرە مێردی نەمر :
محمد رسوڵ هاوار"

**ئاخ وئۆخ** : (متەق) کوڕە دەست هەڵگرە ،دەنا ئەوەندت لێدەدەم ئاخ وئۆختلێ دەبڕم .

**ئادار وپادار** : (چوارچێوە) بەڵایەکی بە سەر رادیۆکە هێنا ئاداری بەسەرپادارەوە نەهێشت .

**ئادی وبۆدی** : چاوو راو ـ هاتەران پاتەران) بە کەیفی خۆی کاران دەکا ئەگەر لێشت پرسی یەوە ئەوەندەت ئادی وبۆدی بۆ دەسەریەک دەکاتەوە ناوی خۆتلە بیر دەباتەوە .

**ئاردو رۆن** : (میوانی)خواردەمەنی ژنی زەیستان کە لە هێندێک ناوچەی کوردستاندا "ئاسیدە"شی پێدەڵێن .

**ئارەزو و ئاوات** : (ئامانج) بێتوو پەلەی نەکەین هەموو ئارەزو و ئاواتمان وەدی دێن.

**ئازاز و کەرەم** : (بە هیچ جۆر) ئەوەندە لە جیرانەکەی تووڕە ببوو ، هەرچیتێیدا شل و کوت بووین . لەگەڵی ئاشت نەبووە

بە ئازازو کەرەم رووی لە ماڵەکەی نەکرد.

**ئازاو رزگار:** (گەردن ئازایی) دایکم لە سەرەمەرگدا گوتی : رۆڵە زۆرت زەحمەت لە گەڵ دیوم رەببی ئازاو رزگاری ماڵی خودا بی و بەردی سارد و گەرمت نەیەتە سەر رێ!

**ئاسمان و ریسمان:** (لە مەبەست دوور کەوتنەوە) ئەو کابرایە وەختێک قسان دەکا زۆر لە مەبەست دوور دەکەوێتەوە و ئاسمان و ریسمانت بۆ تێک دەخاتەوە .

**ئاس و پەلاس:** (هەژار) مام برایم ئەوەندەی نیە دوو ماڵان بە خێو کا .ئاس و پەلاسەو هیچی بە جەرگەوە نیە .

**ئاشقە و ماشقە:** (خۆش ویستنی زۆر) ئەو کچ و کورە ئەوەندە- یان یەکتر خۆش دەوێ دەڵێی ئاشقە و ماشقەن .

**ئاشنا و رۆشنا:** (خزم وکەس) ئەو کابرایە خزم وکەسی زۆرە. زۆر بە ئاشنا و رۆشنایە .

**ئازاو نەبەرد:** (بوێر) خودا بیپارێزێ! پیاوێکی زۆرئازاو نەبەردە .دۆستی تەنگانەیە .

**ئاستەم و دوو بەلا:** (زۆر کەم) هەر بە ئاستەم و دوو بەلا شانم وە پاتی کەوت. ئەو گەڕەکەی هێنامە سەیرێ .

**ئاگا و خەبەر:** (بێزا نین) ئەگەر بە مردنی خۆم زانیبێ بەو کارەم نەزانیوەو ئاگا و خەبەرم لێی نیە .

هیچ ئاگا و خەبەرت لە ئاغایە خۆ نینە
دەمێ ئاغایە خۆت پڕ بۆ لە خوێنە
"بەیتی مەم و زین"

**ئاڵ وبۆڵ:** (نیوەگەیشتوو) ئێستا ئاڵوو باڵووەکە ئاڵ وبۆڵ نەبوو منداڵ دەنکیان پێوە نەهێشت .

**ئاڵ ووالا:** (جوان ورازاوە)
بە بەرگی ئاڵ ووالاوە
هەر چۆنێ لە ناویان باوە
شاڵ وشاپک ،کەواو پاتۆڵ
جل تەنگ ونێفەک فش وفۆڵ
"بۆ کوردستان :هەژار"

**ئاڵ وگۆڕ:** (گۆڕین) کراسی ئاڵ و گۆڕیم نیە .

**ئاڵ و وێر:** (معامەلە- سەودا) کارو کاسبی زۆر شلە، بریا خودای کردبا ئاڵ ووێر وەبرەو کەوتباوە .

**ئام وشۆ:** (هات وچۆ)نەکەی پێیان لێ ببڕی ،ئام وشۆیان

هەر بکە .ئەمەگیان زۆرە بە سەرتۆوە .

**ئانج قولاغ ودینج قولاغ**: (بێدەنگ وکپ) ئەو ماڵە کێشە و هەرایان زۆرە بەڵام من کارم بە سەریانەوە نیە .بێدەنگ دادەنیشم ئانج قولاغ ودینج قولاغ !

**ئاووخاک** : (نیشتمان) هەر ئەو ئاوو خاکەی بە قسمەت بوو .
پیاو ئاوو خاکی خۆی پێ لە هەموو جێگەیەک خۆشترە .

**ئاووگڵ** : (نیشتمان)(قەبر)
خودایە ئاووگڵی مەهابادم بە نسیب کەی !
بمسووریننی ئاوو گڵ

**ئاونزوولە** : (دوعیا) وەختێک کەسێک بە لایەکی زور گەورەی بەسەردی خەڵک پێی دەڵێن داخودا ئاونزوولەی کێ گرتوویەتی .

**ئاین وئۆین** : (فێڵ وتەڵەکە) کەس نازانێ چ ئاین وئۆینێک دەگێرێ !

**ئەخت وچار** : (زۆرحەول دان) میوانەکەم لە بەر دەرکەی راوەستابوو ، ئەخت وچارم کرد نەهاتە ژوور .

**ئەزودین** : من ودینم (ئەلحەق)

**ئەگەرو نەگەر** : (روون نەبوون) نازانم کارەکەم جێ بەجێ دەبێ یان نابێ ، لە ئەگەر و نەگەردایە .

**ئەم و ئەو** : (جودایەتی) ئەم و ئەومان نیە یەک ماڵین .

**ئێرە و ئەوێ** : (مەکان) ئێرە و ئەوێ نازانم .کوێم پێ خۆش بێ لە وێ دەبم .

**ئێسک و پڕووسک** : (وردەئێسقان) ئەو کابرایە لە مێژە ئەمری خودای کردووە ئێستا ئێسک و پڕووسکیشی رزیوە .
گۆشتەکەیان خواردبوو ئێسک و پڕووسکەکەی مابوو

**ئێسک و پێست** : (کزو لاواز) ئەو کابرایە ئەوەندە کزە هەر ئێسک و پێستە .

**ئێش و ئۆف** : (ژان) ددان ئێشە زۆر بە ئێش و ئۆفە .

**ئینجە وفینجە** : (ناز)
بۆهێندەبەئینجە وفینجەی ؟
ئاوریشمی بە لابالاّن هەڵنا گری ؟

# پیتی (ب)

**بابو باپیر:** (پێشینیان)
ولآتی بابو باپیرم
جێی هەڵدانی خۆم و بیرم
"تاریک و روون.هێمن"
کە بەندە و نۆکەری خۆت باش
بناسی باشترە میرم
لە مێژە نۆکەری ئەوخانەدانەم
بابو باپیرم
"شەرەفنامە :میرشەرەفخان.هەژار

**بابو برا :**(خزم و کەس) بە بابو برای خۆی دەنازێ وا ئاوری کردۆتەوە .

**باج وپیتاک :**( سەرانە ) پێشوو مسکێن وجوتبەندەسەرانەیان لێ وەردەگیرا کەبەو سەرانەیە باج وپیتاک دەگوترا وەک پووشانە ، گوریسانە ، مەرانە....

**بارگە و بنە :**(نێومال)خوزگە بەو کەسانەی بارگەوبنەیان سووکە .

**بار و بارخانە :**(کالا)هێندێک کەس بارو بارخانەیان لە هەندەران را بۆدێ .

**بار و بنە :**
کەس نابەتەوەبەرەوژیان لێی
پرسم
لە کوێیە بنەوباری هەواری
یاران.؟
"خەیامی هەژار"

**بار و دۆخ:** (وەزعی زەمانە)لە وەها بار و دۆخێکدا کە کەڵ بە موو بەندەءپیاو هیچ نەڵێ باشترە .

**باز و برد :**(خۆشبەز) ئەو ئەسپە ئازا و بەبازو بردە .

**باس و خواس :**(خەبەر)
نێچیرگری دەنگ و باس و
خواسان
وارێزی وتاری خۆی دەداسان
"شەرەفنامەی هەژار"

**بانگ و سەلا:**(گریان و رۆ رۆ) کوڕی جیرانەکەمان جوانەمەرگ ببوو ، دایکەکەی بە بانگ و سەلا بۆی دەگریا .

**باو و باران:**بە باو بارانێ
هەر لە عەمری بەفرێ کەمە م
دەبێ .
"پەندی پێشینیان"

**باوبژ :** (تۆفان) زۆرجار هەلدەکاتە باوبژێکی وەها کە چاوچاوی نابینێ.

**باوبۆران:**(سەرمای سەخت)
بێ ترسی چەتەوگۆران

گوێ نەداتەباوبۆران

**برسی وتینوو :** ( بێ تێشوو )
برسی وتینوو رێگام بڕیوە
هەتا گەیشتوومە ئێرە .

**برک وژان :** ( دەرد )
دوێنێ شەوێ پاشرنان
خورانان برک و ژانێکم لە
پشتی وەستا .
برک وژانم لەدڵی یە
لەکەندالێم باز
بردی یە
درۆێکم لە پێی
هەڵچی یە
"بەیتی شێخی سەنعان"

**بڕو بیانوو :** (پەڵپ) زۆر کەس
هەن خەویان نایە و هەر
جینگلآن دەدەن وبە بڕوبیانوون
ودەڵێی نوێن وبانەکە زیندووی
تێدا .

**بڕیارو بەڵێن :** (قەرار) جاری
واهەیە بەڵێنی بە کەسێک
دەدەین کە کارێکی بۆ جێ بە
جێ بکەین .دەبێ بە گیان وبە
دڵ بڕیارو بەڵێنی خۆمان
بەرینە سەر .

**بست وقولانج :** (پێوار)بە بست
و قولانجی تۆی ناپێوم .

**بگرەو بەردە :** (ئازار)
دەڵێن ناحەقتەشەڕوور وجەردەی
خودا چۆن دەرچم لەوبگرەوبەردەی

**بنا وبوێر :** برینێک کەگۆشتەزوون
نەهێنێتەوە .
ئاونگی سەروەنوشان
دەرمانی بناو بوێران
(ئالەکۆک : هەژار)

**بنج و بناوان :** (سەرەدەر)زۆرم
لە پرسیارەکەت کۆلی یەوە ،
چاک پشکنیم .بە بنج وبناوانی
داچوومەوە هەتا وەلآمێکی
راست ودروستم بۆ دیتەوە .

**بنەو بنەچەکە :** (رەگەزوتۆرەمە)
بە بن وبنەچەکەی هەر کەس
دابچینە خوار یا بە دۆست
دەردەچێ یا بە دوژمن .

**بۆن وبەرام :** (بۆنی خۆش)

**بووزوو و چرێش :**
ئەو کابرایە نەنبەڵ و تەوەزەلە.
هەر کارێکی پێی دەسپێری ،
بوزوو و چرێشی دەکاو
وەلای دەنێ .

**بووک و خەسوو :** ئەو دوو ژنە
بووک و خەسووایەتی یان کرد،
بۆیە وایان بە سەر هات .

**بوون ونەبوون :** (سامان)
زۆری وەکوو مەی قەزاو قەدەر
چاندو دروون
بێهوودە چدا گرم خەمی بوون
ونەبوون !

**بەتاڵ وحەتاڵ :** (خالی)گیرفانم

منتدى إقرأ الثقافي

بە تالّ و حەتالّە .

**بەتاوتێ** : (بە تین)ڕۆژ کە تیشکی داوێتە سەرزەوی زۆربە تاوتێ یە .

**بەخت وئیقبالّ** : (هات)زۆرکەس پێیان وایە بە خت و ئیقبالّ هەیە . وەختێک لە کارێکدا سەر ناکەون خەتای بەخت و ئیقبالّ دەگرن .

**بەخت وبنە** : (داهاتوو) بەخت وبنە ڕەش نەبێ کچم .

**بە خێرو شادی** : (بەخۆشی) لەبە سالّی داهاتوودا ئیشالّلا بە خێرو شادی ژنێ بۆکوڕەکەم دێنم .

**بەدارو بار** : (پڕ بەرهەم) ماشاالله چاک بەوباغەی ڕاگەیشتوون زۆر پڕ بەرهەم وبە دارو بارە .

**بە دلّ وداو** : (پڕتاسە) بە دلّ وداو کراسێکم کڕی بەلاّم باسم نەیهێشت لە بەری کەم .

**بە دلّ ودەروون** : (بەڕەحم)ئەو پیاوە گەلێک چاکە لە گەلّ ئاتاج وموحتاجان دەکا بە ـ ڕاستی پیاوێکی بەدلّ ودەروونە

**بە دلّ وگیان** : (لەناخی دلّەوە) هەمووکەس دەبێ نیشتمانی خۆی بە دلّ وگیان خۆش بوێ و خزمەتی بکا .

**بەرو بوو**:(زەوی داچاندنی بێ شێوو شێوەرد)کاکە، ئەو زەوی جارو جڕەی بە بەروو بوو و دایدەچێنێ،بێلّی لە خەرمانت ناچەقێنێ .

**بەرو بوو** : (بەرهەم) نووسەرو شاعیرەوەک باغەوان وان،بەر- هەمی مێشک و چەوسانەوەوشانو باهۆی خۆیان دەدەن بە کۆمەلّ. کۆمەلّیش لە بەروبووی ئەوان دەحەسێتەوە .

**بەرو بوخچە** : (شت ومەک)ژنەکەی دەستێکی بە مالّێ داهێنا و ئەوەی هەبوو نەبوو وەکۆی کردوبەرو بوخچەی تێکنا و چووە مالّە بابی .

**بەرو بوو** : (ماوە- مەودا )ئەو زستانە بەرو بووی درێژە و وازوو نابڕێتەوە .

**بەروبەربێنە** : (جلکی کار)ئەو کابانە زۆر لە بارە.چاو لە بەرو بەربێنەی بکە وەبیرژنە کادەروێشیان دەکەوێ یەوە . کابان بۆمەر دۆشین بەروبەر- بێنە لە خۆیدەدا .

**بەرو پشت** :ئەو کابرایە بەـ روپشت ئەتلەسە.واتە،دایک و بابی سەیدە یان ئاغایە .

**بەرو تەندوور** :تەماشای بەرو تەندووری بکە .ڕووی سپی بێ

کابانی گەورە ماڵانە .

**بەرو جیاز:** (ماڵی بووک) ئەو بەرو جیازانە لە ماڵە بووکەوە هاتووە .

**بەزم و ڕەزم:** (خۆشی و هەرا) شایی و هەڵپەڕین بێ بەزم و ڕەزم وزرم و کوت و شادی و گۆرانی خۆش نیە . منداڵینە ئەو بەزم و ڕەزمەتان لەچیە؟

**بەزو بنێشت:** (مەڵحەم) دەرمانێکە لە تێکەڵ کردنی بەزی مەڕ یا بزن لە گەڵ بنێشت دروست دەکرێ بۆ زووتر دەربوونی کوان و کوتر و شتی ئەوتۆ .

**بەژن و باڵا:** (قەڵافەت)
بەژن و باڵاکەت نموونەی
هەیکەلی وێنانی یە
لارو لەنجەت مۆسیقایە
بەستەیە ، گۆرانی یە
"هەردی.شیعری ستفاتمە"
بە تاسکە تاسک وبەلەنجەولارت
بە بەژن و باڵای بەرزو لەبارت
"تاریک و روون ل ٤٦"
ڕەشماری کەزی لە بەژن و باڵا
وەکوو هەورە ڕەش لەرۆژدەهاڵا
"مەمو زین.هەژار"
دۆستی وراستی پارچێک بووکرا
بە بەژن وباڵای بەرزی تۆ بڕا
"دیوانی سیف القضات ل٧٩"

**بە ئاستەم و دوو بەلا** (زۆرکەم) منداڵەکەمان لە سەر سەکۆ کەوتە خوارەوە ، بەر بۆوە هەر بە ئاستەم و دوو بەلا کەپۆی داڕووشا .

**بەلاش و حەلاش:** (بێکار) بۆ ئەوە کەس بزانێ لە چی دەگەڕێ بەلاش و حەلاش دەخولێتەوە .

**بەند و باو:** (بوختان و شایعە) ئێستا لە باتی ئەوبەندوباوە بە بێ شوورەیی پرچ برین باوە

**بەند و بەست:** (کاری فێڵاوی) ئەوەندە فێڵبازە کەس لە بەندو بەستی ناگا .

**بەند و بەستەڵەک:** (سەرمای توند)
منالیان ئەکوشت بەندو
بەستەڵەک
ریشەیان کرووست کەرۆیشک و
دەلەک

**بەیت و بالۆرە:** ئەو کچەی کە تێ باسی دەکەی بەیت و بالۆرەیەکی زۆریان وەدوا خستبوو ، قسەیەکی زۆریان بۆ هەڵبەستبوو . پیاو هەق بڵێ ئەو جۆرە شتانەی پێوە نانووسێ ، لە ئاوی شەوپارێز دەکا .

**بەیت و باو:** زۆر کەسی خراپ و دواکەوتوو هەن کە بوختانان

دەکەن وقسە هەڵدەبەستن بە خۆڕایی خۆیان لە ئیمان دەکەن .

دمدم وبرایمۆک بەیت وباو یان پێدەڵێن

**بەین و بەینەڵڵا** : (حەتمەن) بەین وبەینەڵڵا جوانی گەلێک لە بەر دڵانی "گۆرانی"

**بێزو بۆ** : (حەمبەڵی بوون) ئەو کوڕە زۆر بە بێزو بۆیە .هەر چی لە پێشی دادەنێی عەیبێکی لێ دەبینێتەوە .

**بێ سەرە و بەرە** : (پاشاگەردانی) ئەو ماڵە زۆر بێ سەرە و بەرەن ، گەورەو چکۆڵەیان لە نێودانیە .

**بێنە و بەرە** : (ئازار) چوومە ئیدارەی ...بێنەو بەرەیەکیان پێ کردم لە گیانی خۆم وەڕەز بووم .

**بێ ونەبێ** : (رەنگە) ئەو ماڵەقەدەرێکە بێ هەست و خوستن بێ ونەبێ شتێکیان لێ قەوماوە .

**بیرو ڕا** : (نەزەر) بیروڕای خۆت سەبارەت بەو کارە دەربڕە .

**بیر و باوەڕ** : (ئیمان)ئەگەر لەت و پەتم کەن دەست لە بیرو باوەڕی خۆم هەڵناگرم .

# پیتی (پ)

**یان وبەرین :** (هەروا )
دەشتی حاجی حەسەن دەشتێکی
پان وبەرینە .

**پانوپلێش :** ( لەبەرپێیان داچوو)

**پانوپۆڕ :** (بەرین)
گەردن بلێندو سینگ و کەفەڵ
هێندە پان وپۆڕ
باریک و شووشە قامەت وقەد
چاو خەواوی یە
"دیوانی سیف القضات ل ٧٦"

**پان وفلێچ :** (پێ رێخراو)
زۆر پان وفلێچ دەبن لە رێدا
دەفلێقنەوە لە ژێر پێدا

**پاو پووز :** (لە ئەژنۆبەرەخوار)
لە پردی سوور بەم لاوە
پاو پووزی هەڵداوە
پاو پۆوز دەڵیی زێڕە
پاوانەی تێکراوە

**پرتە و بۆڵە :** (بیانوو گرتن )
دایە خانم دەورەی چۆڵە
لێم کەوتۆتە پرتە وبۆڵە
"هێمن"

**پرخ وهۆڕ :** (دەنگی خەوتوو )
هێندێک کەس وەختی نووستن
دەست دەکەن بە پرخ و هۆڕ .
نایەڵن هیچکەس خەوی لێ
بکەوێ .

**پردووپێنا و :** ( خوداگیر )
یا خوا ئەگەر سەبەبکاری من
تۆ بی بەپردوپینا وم بی .

**پرس وڕا :** (راوێژ ) وەختێک
کارێک دەست پێدەکەین ،دەبێ
لە پێشدا پرس و ڕا بە چازان
و لێزانان بکەین،بووەی لێمان
پووچەڵ نەبێ .

**پرش وبلاو** (بڵاو بۆوە )
وەک تۆوی زەوی پڕش وبڵاوبۆتەوە

**پڕو پووچ :** (بێ بایەخ )
بەعزێک تووشی هەر هەڵەیەک
دەبن، بە سەر خەڵکی دادێنن
لە خۆڕا بە بڕو بیانووی پڕ و
پووچ خەڵک تاوانبار دەکەن .

**پڕو پووش :** (گیا وگۆڵ) سەرە
بەهاران سێلاو پڕو پووشێکی
زۆر لە گەڵ خۆی رادەدا و ئەو
پڕو پووش وگیا و گۆڵە لەبن
پنچکان کۆ دەبنەوە .
لافاوی میژوو بە گوڕ و تاوە
پیسی و پڕو پووش ئەخاتە لاوە
"هەژار"

**پڕو پیرێژن :** ( ژنی گەڕاوە)
پڕو پیرێژنێکی زۆر چووبوونە

سەر چاکی .بە قسەی پیرو پیرێژنا ن ما لێ لە خوت مەشێوێنە .

**پشت و پەنا** : (جێگای هومێد) دا یک و با بی چا ک خەمی مندا ڵیا ن دەخۆن و دەبنە پشت و پەنا ی ئەوا ن .

ئەگەر سەد هێندەش هەزا ر بین بێ پەنا وپشت و داژدا ربیین ئەو دڵ بریندا را نە گشت لە یەکتر دەبنە پەنا وپشت

"بۆ کوردستا ن ل٨٠"

**پشتەو شکێن** (بەرەوپشت شکا ندن) بێتوو پیا وی پشتەو شکێن بکەن دەمرێ . زۆر جا ری وا هەیە لە زۆرەبا نیدا پیا و پشتە و شکێن دەبێ .

**پنج و مۆر** : (تەوقیف) ئەو ژنە پنج و مۆر کرا وەونا وێری لە ما ڵ بێتە دەر.

**پوخت وپا را و** : (رێک وپێک ) کا با نی چاک لە ما ڵدا پوخت و پا را وە .دەست بە شتەوە دەگرێ و نا یەڵێ هیچ شتێک خەسا ر بێ .

**پووش و پەڵاش** : (با بردەڵە ) هیچ پووش وپەڵاشی تێ نەچووبێ نا بێ بە گرێ و گلوو گلوو بێ

"مەموزین ل ١١١"

نا زا نی ئەگەر چونە بە دەس دەردەوە حا ڵی وەک پووش و پەڵاشێکە بە دەم با وە دڵی من

"دیوا نی بێخود ل ٦٦"

**پەت و سینگ** : (جێگای ئۆیا ری کرا و) لە قۆنا غی گەڵێک با غدا سەگ را دەگرن سنگیکی بو دا دە کوتن وپەتیکی لی دەبەستن پیی دەڵین پەت وسینگ

"قسەی پیشینیا ن"

**پەرداخ و پۆشتە** : (کۆک) ئەو کا برا یە زۆر بە خۆی رادەگا و بە خۆی دا دێ و دەچێ . ئەوەندە پەرداخ و پۆشتەیەلە نێو خەڵکدا دیا رییە و دەست نیشا نە .

**پەرش و بڵاو** : (هەڵوەشا و ) تا گەنمەکە لە سەر ما شین را هەڵدێرا ،پرش و بڵاو بوو .

پەرچەم لە سەر روو پەرش و بڵاون

وەک میشک و کا فوور تێکەڵ کرا ون

**پەڕ و با ڵ** :خەیا ڵ دەڵێی با ڵندەیە و پەڕوبا ڵی هەیە .

هەردی نەجد گەڕا م جێی قەیسی دا ما و

وێنەی پەڕوا نەی پەڕو با ڵ سووتا و

"

"دیوانی وەلی دیوانە ل٢٦

**بەرۆ و پاڵ** : (کوتە پارچە )
داری چاکی زۆری بەرۆ و پاڵ
پێوە .

دەڵێی تێ هۆش و گۆشم مودەتێکە
هەر دەناڵێنم
خودا رەحمێ بکەی بەو مورغە
حەپسەی بێ بەرو باڵم
"دیوانی وەفایی ل ٥٤"

**بەرو پۆ** : (جلک و لیباس )

**بەروپۆ** : ( ماڵ وسامان)

**بەڵپ و بیانوو** : (بەهانە ) زۆر
منداڵی نەعا ملاوی واهەن کە لاق
لە عەرزی دەوەژێنن و دەست
دەکەن بە نووکە ، نووک و
بەڵپ و بیانوو !

**پەنا و هومێد** : (پشتیوان)پەنا و
هومێد هەر تۆی خودایە .

**پەنا و پەسیو** : (قوژبن)پشیلە
کە وەدووی مشک دەکەوی هەزار
پەنا و پەسیوی پێدەکا .

**پێچ و پەنا** : (فێڵ و درۆ) لەو
پێنج و دوو رۆژەی ژیاندا
هەموومان دەبێ راست بین و پێچ و
پەنا و چاپ و چووپمان نەبێ .

**پێچ وکڵاو** :

بەم پێچ و کڵاوە دەبێ بە
بیاوێکی دیکە .

**پێنج و دوو**: (ماوەیەکی کەم)
دنیا پێنج و دوو رۆژە .

**پێ و پل** : (لاق) بەم پێ و پلە
پیسە مەیە سەر فەرشان .

**پێ و دان** : (رێ و شوێن)
هەر بەو پێ و دانە کە بۆت
داناوە
وادێت و دەچێ هیچ نەسواوە
"دیوانی پیرە مێرد ل ٣٧٧"

**پێ وقەدەم** : (هاتن)
میوان بە خێر بێ،سەر چاوان .
پێ و قەدەمت بە خێر بوو،
خەبەرێکی خۆشیان دامێ .

**پیت و بەرەکەت** : ( پربەرهەم )
مەڵبەندی کوردستان زۆر بە
پیت و بەرەکەتە .

**پیت و لەتێک** : (کۆڵکە سەودا )
خوێندەواری وا هەیە هەر
پیت و لەتێکی دەزانێ و خۆی
بە مەلای دوازدەعیلم
ناگۆڕێتەوە .

**پیرقەل و برازا** : (خزمایەتی
نزیک) بیرو باوەڕی ئەو دوو
لاوە هەرزەکارانە زۆر وەک یە-
ک دەچن و خزمایەتیشیان هەیە.
بەڵام نەک ئەوەندە دوور کە
بڵێین کەرو خوڵەمێش بەڵکوو
ئەوەندە نزیک کە بڵێین پیر
قەل و برازا .

**پیرو خەرۆ** : (بەتەمەن)
یا خوا کابرا لە گەڵ خێزانت

پیرو خەرۆ بن .بەردی سارد و گەرمتان نەیەتە سەر ڕێ .بە خۆشی وخێرو بێر ژیان رابوێرن

**پیرو زورهان** :(لەکارکەوتوو) پیروزورهانم و ئێستاش دڵەکەم
هەر دەیەوێ
سەروماڵم بە فیدای خاڵ وخەت
و پەرچەم کەم
"تاریک و روون ل ١٦١"

**پینەو پەڕۆ** :(جلکی دڕاو)
زستانان پینە و پەڕۆ
هاوینان قیت قیت بڕۆ
"گفتی بێشینیان"

# پیتی (ت)

**تات وبەرد**: (بەردی پان ولووس) نوێژی ئێوارەم لە سەر تات و بەردەکانی خوارێ کرد .

**تار و دنبەک** :(موسیقا ) بووکیان گوێستەوە بە تار و دنبەگ .

**تاریک و تنووک**: (شەوەزەنگ) ئەو شەوانەی مانگ هەڵنایە، وڵات تاریک و تنووکە . قەبر تاریک و تنووکە .

**تاریک و روون** : (بەرەبەیانێکی زوو) تاریک و روونی بەیانی لە خەو هەستام .چوومەسەرکار .

**تازە و نوێ** : (لەبەرنەکراو) پێڵاوی ئەو منداڵانە هەر تازە ونوێیە ، بەڵام لە بەرچاویان کەوتووە .

**تاژی و توڵە**:(بیحەیا ) چووم لە گەڵ بابەکەیان قسە بکەم چما هێشتیانتاژی و توڵەی دنیام لێ وەخر بوو وەخت بوو بمخۆن .

**تاس و لووس**: (بێ گەرد )

ئەو کەسەی راموسێ کولمەی
تاس و لووس،
ئەو کەسەی تێی هەڵنەدا بێ
چارەسووس،
"نالەی جودایی ل ١٤"

**تاق و تەنیا :** (بەتەنێ)
هێندەی کەحودای بەتاق و تەنیا
پوول و شەکی رژانیدە دنیا
"مەم وزین هەژار .ل٢٢"

**تاق و جووت:** (ورد و درشت)
هێرشیان بردنە سەر و تاق
و جووتیان لێ برین .

**تاق و لۆق :** (بەدەگمەن)شێوارە
کە گەڕامەوە ماڵ،تاق ولۆق
خەڵک بەدەرەوە دیار بوو.

**تاک و تەرا :** (تاق ولۆق)
دارەکانی ئەم باغە ئەو ساڵ
هەمووی سەرما بردی.تاک و
تەرا ماون دەنا هەمووی وشک
بوون .

**تالان و برۆ :** (غارەت)
لە تالان و برۆ ئازان
لە رێ گرتن هەموو وریان
درۆ ناکەم بپرسن وان
"تاریک و روون ل ٥٣"
درندەی هارو ماری بێ رەزسو
لە تالان و برۆیە شارەزا بوو
"نالەی جودایی ل ٥٣"

**تاڵ و تیژ :** (ناخۆش) چێشتەکە
ئەوەندە تاڵ وتیژ بوو، بۆم
نەخورا .

**تاڵ و سوێری :** (مەینەت)
گەلێکت دی غەریبی وتاڵ وسوێری
نەبووساتێ لە خزمەت خۆسوێری
"تاریک و روون ل ٢١٥"

**تاڵ و شیرین :** (خۆشی وناخۆشی)
گەلێکم رۆژگاری تاڵ و شیرین
رابواردئاخۆ
مەرگ مەودا دەدا دیسان ببینم
سەردەمێکی تر ؟
"نالەی جودایی ل٥١"

**تام و بۆن :** (مەزە) کابانی
واهەن دەستاویان زۆر خۆشە
و چێشتی بە تام و بۆن
لێدەنێن .

**تام و خوێ :** (مەزە) لەم چێشتە
بچێژە بزانە تام و خوێی
چۆنە .

**تانج و تەخت :** (حکوومەت) یا
خوا تانج و تەختی ئەو شا
زالمە وەرگەڕێ .

**تان و پۆ :** (چوارچێوە)
تاپۆیە، لەتۆبەتان و پۆیە
تاریکی و روشنی لە تۆیە

**تاوو ساو :** (هەوای خۆش) دوێنێ
تاوو ساو بوو ،تەنانەت پەڵە
هەورێک لە ئاسماندا نەبوو.
هەورازێکمان لە بەر ماوە
لەو دیو خۆشی و تاوو ساوە
بۆ کوردستان ل١٠٤"

**ترس و لەرز** : (خۆف) هێندێک مندالّ هەن وەختێک ماموٚستا دەرسیان لیّ دەپرسێتەوە دەخەجلّێن و بە دەم ترس و لەرزەوە ولاّم دەدەنەوە .

**ترش وچەوەندەر** : (ناخۆش) جا وەرە لیّی دە ، چت خواردووە ترش و چەوەندەرا

**تریق و هوّڕ** : (زیقە زیق)مندالّیّ باوخۆش دەم بە پێکەنینە .جاری واهەیە پێکەنین و تریق و هوٚڕی هوّگانە جووتێک دەڕوا .

**ترو توّپ** : (قسەی زل)زوٚر کەسی واهەن سەر زارەکی چییان تێدا نەهێشتوٚتەوە بەلاّم وەختی کار لە ترو توٚپ بە دەر چیان لە باران دانیە .

**تفت و تالّ** : (ناخۆش) ئەوبوٚیە باوەڕێنانە نەگەیون تفت و تالّن .

بە تفت و تالّ و سارد و گەرم
وناخۆشی ژیان رادێن
بە گژ تین و بلّێسە و بەفر و
باران و هەور دادێن
"تاریک و روون ل ٥٩"

**تف و لەعنەت** : (تووک)بێتوو کردەوەمان چاک نەبیّ خەلّک تف و لەعنەتمان لیدەکەن.

**توخم وتوّو** : (رەگەز )خودا توخم وتوّوی کەلّەی ببڕیّ .ئافەتە بوّ شیناوەرد و مێلّەبوّ بژیو

**توندو تۆلّ** : (گورج)
بلّباسی توندو تۆلّن
بە مژۆلّ جەرگان دەکوّلّن
"تاریک و روون ٥٩"

**توندو تیژ** : (تووڕە )
کاربەنەرمی وشلی نەیەت چاری
توند وتیژی دەبێتەسەرباری
"شەرەفنامە ل ٧٠٥"

**توێخ ولوێخ** : (چەرمەسەری) تا ئەو قامووسەم ساز کرد لە توێخ و لوێخ بوومەوە .

**توێخ ولوێخ** :کالّەی خاو بە سەرما پێی بڕوّی توێخ ولوێخ لە پێی پیاوی دەکاتەوە .

**توّپ وتەشەر** : (تانە ) براکانی لیّی کەوتنە توّپ وتەشەر .
"پێکەنینی گەدا ل ١٠٤"

**توّزو خوّلّ** :
پایزان جار جار هەلّدەکاتە گێژەلّووکە وتوّزوخوّلّێکی زوّر بە ولاّتدا بلاّو دەکاتەوە .

**توّق وتەلیسم** : (ملوانکە )
توّق وتەلیسم و لاگیرە
گوّ بەروّک ،ملوانکە ، لیرە
"بوّ کوردستان ل٥٢"

**تووتن وپەڕ** : (جگەرە ) تووتن و پەڕی خوّم سلاّمەت بیّ جگەرەی دیکەم ناویّ .

**تووتەک وبالّەبان** : (موّسیقای

حێژنی رەسمی) ئەورۆژجێژنە ، خەڵک هەڵپشکووتوون ولوزەـ ویان بەستووە ،تووتەک و باڵەبان لێدەدرێ .

**توورو گێزەر**: (بێ بایەخ ) ئەو هەموو ئەنتیکە وگەنجە بە نرخانەی باسمان‌کردن وەکوو تووروگێزەرێ‌دەکران و دەفرۆشران .

"کوردلە مێژووی دراوسێکانیدا، وەرگێرانی سەعیدناکام ل ٢٨٥ "

**توورە و تۆسن**: (قەڵس) پیاوی توورە وتۆسن لە خۆرا دەرهەـ لێدەبێ .هەڵدەچێ دوایە خەناو دەبێتەوە .

**تووک ودوعا**: (نزا )نابێ ئادەـ میزاد خۆی ئەوەندە لە بەر چاوی خەڵک رەش بکاکە بکەوێتە بەر تووک ودوعای خەڵک .

**تووک ونزا**: (دوعای خراپ ) بەدرەقەی رێگەی‌تۆبێ تووک ونزای پیاوو ژن ..

"تاریک وروون ل ١٢٨"

**تەبا و رەبا**: (بی کێشە ) ئەو ماڵە زۆر تەباورەبان شەرو کێشەیان لە نێودا نیە .

**تەپ وتۆز**:

هەتا وشترمەها ردەکرێ بەلمبۆز هەتاکووبای ئەماڵ دێنێ تەپ وتۆز

"دیوانی سیف القضات :٤٧"

**تەپ ومژ**: دوێنێ تێی هەڵکردە بایەکی توند .ئەو تەپ ومژەی کە سەری کێوانی داگرتبوو هەمووی راماڵی .

**تەخت وبەخت**: (خۆشی وکەیف )

رێی وانە کەهکەشان و رێی ئێمە بەردەڵان
جێی وانە تەخت وبەخت وجێی ئێمە بەردوچێو

**تەخشان وپەخشان**: (بڵاوکردنەوە) لەسەر گۆلی گوێرەشان کردیان بە تەخشان پەخشان

"گۆرانی"

**تەخم وتەدارەک**: (تەشریفات ) دوێنێ بووکیان دەبردە ماڵی زاوا،بە تەخم وتەدارەک بوو .

**تەرت وتونا**: (بنەبڕ )

چی دین وگەلن لەناوی بردن
یان تەرت وتونا و بڵاوی کردن

"مەم وزین ل ٩"

**تەرح وديدار**: (دیمەن)

خودا ئەوتەرح ودیدارەبڕێ ، وەک ئادەمیزاد نەبێ وەک هەمووشت دەچێ .

**تەڕوبڕ**: (خووسان)

تەڕوبڕ: پاش بارانی دوێشەو ولات تەڕوبڕە .

**تەڕو تلیس**: (خووسان)لە حەوز

کەوت وتەڕو تلیس بوو .

**تەڕو وشک :** (بە عام) ئاوری بە هێز، تەڕو وشک پێکەوە دەسووتێنێ .

**تەشک وداوێن :** (کراس) کابانە قوڵەی گەورە ماڵان .تەشک و داوێنی لە عەرزی ناخشێ بەڵام هەر رمبەی لە عەرزی دێنێ .

**تەڕو تووشی :** (سەرما وقوڕو ـ چڵپاو) لە ئاخرو ئۆخری زستاندا، کە بەفری کووچە و کۆڵانان دەتوێتەوە قوڕوزەلەق وتەڕوتووشی پرزە لە هات و چۆکەر دەبڕێ .

**تەفرو تونا :** (تەرت وتونا )

**تەق وتۆق :** (شەڕوهە للا )

لەوخوارە تەق وتۆقێک بوو

باب ئاگای لە کوڕی نەبوو

دەتگوت برێشکەی سەر سێڵە

**تەقڵە و رمبازی :** (کایەی داوەت )

کوێربمنا بینم خێڵ بەرەوخواران

تەقڵەورمبازی وهەوهەوی سواران

**تەقە و رەو :** (بۆ شایی) لە هەوەڵەوە چاکان هێرش بەردە سەر دوژمن و پرزەیان لێ بڕی بەڵام دوایە پاشەکشەیان کرد و تەقە و رەویان تێکەوت

**تەق و لەق :** (لەرزۆک)

کورسی یەکی تەق و لەقمان بوو، زستانان دەمانهاویشت و هاوینان لە سەر پێڕکمان دادەنا .

**تەقە و رەقە :** (هات و چۆ) ئەو ماڵە کەم خێزانە، تەقەورەقەی کەمە .

**تەقە و لێکدان :** (شەڕ) بۆ ماوەی دوو سەعات تەقە و لێکدانێکی توند بوو .

**تەمبەڵ و تەوەزەل :** (کارنە کەر) تەمبەڵ و تەوەزەل وێکڕا قسەیان دەکرد .تەمبەڵ گوتی سبەینی ناچینە گێرە تەوەزەل گوتی : با دووسبەش نەچین .

"فۆلکلۆر"

**تەمبەڵ و دەستەوەستان :**

(دەست و بێ سپیلکە ) تەمبەڵ و دەستەوەستان .

یەک لە گەرمێن یەک لە کوێستان

بە جووتە لێک هەڵدەستان

"فۆلکلۆر"

**تەم و مژ :**

زستان زۆیی سەرما نەما دەرچوین لە ناو مژ و تەما

زستانان جارجار هەوری تەنک دێتە خوار و رێکی عەرزی دەبێ کە پێی دەڵێن تەم ومژ .

**تەندوور و ئاور :** (کەل وبەل و

کەرەسەی نان پێ کردن )
تەندوور و ئاوری خۆمــــــەدە
زمهەریش بە پێی فیلان کابانی
دەبێتا و خۆیشیش لەوێرێ وەستێ .
**تەنگانەو لێقەومان [illegible]ڕۆژی** سەلا) دۆست و دوژمنت لە کاتی
تەنگانە و لێقەوماندا تاقی
کەوە .

"گفتی پێشینیان"

**تەنگانە و فەرعانە :** (هەمیشە )
دۆستی چاک لە تەنگانـــە و
فەرعانەدا دۆستە .

**تەنگا و تێلکە :** بارەکەمان لە
سەر پشتی گوێدرێژ دانا وتەنگا
و تێلکەماندا .

**تەنگ و تار :**
لە نێو قەبری تەنگ و تار
بوومە یاری مشک و مار
سەلا لە منی بریندار

"فۆلکلۆر"

**تەنگ و تاریک :** (تەسک)
کووچەی کرماشان تەنگ وتاریکە
عاشقی کچێکم کەمەر باریکە

**تەنگ وتیوار :** (چەسپ ) رانک و
چۆغە دەبێ لە قەدەر بەژن و
بالا بێ .بێتوو فش و فۆل بێ
یا تەنگ و تیوار ، پیاو ناحەز
دەنوێنێ .

**تەنگ و چەلەمە :** (گیروگرفت )
ژیان پڕ لە تەنگ و چەلەمەیە
و شادەمیزاد نابێ بەزێ و
دەبێ قۆڵی بۆ هەڵماڵێ .

**تەنگەوپاڵوو**
هەر دەتکەمە تەنگە،دەبێتەوە
پاڵوو .

**تەوس و پڵلار :** (تەشەر ) شێخ
ڕەزای تاڵەبانی شاعیرێکی
فرهاوێژی بەرزەوشێعرەکانی
پڕن لە تەوس و پڵلار .

**تێروپڕ :** (دەوڵەمەند )
کابرایەکی تێروپڕە و ئاگای
لە دەور و بەری نیە .

**تێرو تەسەل:** ( بەئێروو )

**تیسقەوفەلاسقە :** (کەرەسەی سواری)
لەرابردوودا کاتێک سواران
سوار دەبوون ،تیسقەوفەلاسقە ـ
یان لە گەڵ خۆیان دەبرد .لە
زۆربەی بەیتەکانی کوردی وەک
سوارۆ وپابزە ئەم دوو وشە
بە دوای یەکدا هاتوون .

**تێک وپێک :** (لە بەریەک هە ـ
ڵوەشاندن) بێتوو ئێمە بە
خانووەکەمان رانەگەیەن
دەڕووخێ وتێک وپێک دەچێ .

**تێکەڵ وپێکەڵ :** (لێک دراو )
ئەو گشتە کەوا تێکەڵ وپێکەڵ
بووە ،بۆم لێک نابێتەوە .

**تێکەولێکە :** ( سەرلێ شێواندن)
چوومە ئیدارەیەک کارێکم بوو .

لێ یان کردمە تێکەولێکەیەک
ناوی خۆیان لە بیر بردمەوە .

**تیک ودرووومان :** ( دروون)
کابانی ماڵ دەبێ جلکی مندا ـ
ڵان پینەوپەڕۆ بکاو ئەوتیک
ودروومانە ئەرکێکە کە بە
جێی دێنێ .

**تین وتاو :** (گوڕ)
زەردەی رۆژ پەڕی مانگی
خەزەڵوەرتین و تاوێکی زۆری
نیە .

هاوارو گرین وداد و شینی
بردی گوڕو هێزو تاوو تینی
"مەم وزین ل ١٠٢"

**تین وتەوژم :** (گوڕ) تاوی
هاوینێ بە تین وتەوژمەپیاوی
دەبرژێنێ .

# پیتی (ج)

**جاروبار :** بەهەڵکەوت
جاروبار خوێن دەدەڵێ و
دێتەوە سۆ
خوێن وگڵ تێکەڵە هانامە
بە تۆ
"بۆ کوردستان ـ هەژار"
ل ١٤٣

زەمانە هێمنی تۆی وێڵی دەشت
وچۆل و سەحرا کرد
فەرامۆشی مەفەرموو جاروبارە
هەر بکە یادی
"تاریک و روون ل ١٠٣"

ئەو کەسەی پەنجۆلە بکوشێ
جارو بار
ئەو کەسەی دەستی بگاتە
گەردنی یار
"نالەی جودایی ١٤"

کە نزمی و بلندی دەبن جاروبار
خودایە و بەدەس خۆیەتی کاروبار

**جا ڕزو وەڕەز :** (وەگیان هاتوو )
لە وەختی زوڵم و زۆریدا جاری
واهەیە پیاو دەستی پێ ناکر ـ
ێتەوە هەر لە پاڵ خۆیدا پیش

دەخواتەوەو ئەوەندە جاڕز و وەڕەز دەبێ مەرگی خۆی بە ئاوات دەخوازێ .

**جرپ و جۆپ:** ( پڕوپووچ) ئەو کابرایە هەرزە .ۆیە،هەرچی دەیلێ جرپ و جۆپە .

**جوت وفرت :** (هەڵبەزین)
قەیوان و قوترە و کۆنەماسی
لە دەست نەدەین
دوایی بە جرت و فرتەوە هانا
بۆ کێ ئەبەین
"پیرەمێرد .هاوار .ل ٢٥٢"

**جریوەوجووکە :** (نووزە )
جۆلەکە تا پەڕەوازە دەبێ لە هێلانەدا و جریوەو جووکەی تا دوور دەڕوا .

**جریوە و زریوە :** (دەنگی مەل ـ و باڵندە )
جریوەو زریوەی چورەو چۆلەکە نایەونەیانما ،هێلانە و هێلکە

**جریوە و قریوە :** (سرت وخورت)
هەر کە ژاندرمە وە نێو دێ کەوتن،جریوە و قریوە لەنێو خەلکدا پەیدا بوو .

**جڕ و جانەوەر :** ( داعبا ) زۆر لەمێژ بوو جلکی نەگۆڕیبوو . زۆر دژوێن بوو ،ئەگەر چاوم لە لیباسەکانی کرد جڕ و جانەوەری دنیای تێدا بوو . لەتاوان هێندێکم بۆ تێوەشاند

**جل و بەرگ :**
بیست و حەوت ساڵە من
ڕەنجبەری تۆم
بە نان وئاوو جل و
بەرگی خۆم
ڕەتاندوویانم لە عەرەب وڕۆم
کە چی هەر وەها دیل و ڕەنجەڕۆم
"دیوانی فایق بێکەس"

هەمیشە خاوەنیکۆیلەو کەنیز بوو جل وبەرگیهەتاحەزکەیتەمیزبوو

**جل و بەڕ :** (کورتان )
ئەو گوێدرێژانە جل و بەڕ کە با بچین ئەو بارانە بێنینەوە

**جل وجۆڕ :** (شت و مەکی گوێدرێژ )
جل وجۆڕی کەرەکە لە جێیەکی دابنێن کە ڕەگەڵ شتی دیکە نەکەوێ با ئەگەر کارمان پێی بوو زوو وەبەر دەست بێ .

**جلیت ودار :** (رمبازی)
دیسان هات وەکوو جاران
هەو هەوی شۆڕە سواران
ویڕەی جلیت و داران
خرمەی ناڵ و بزماران

**جلق و فلق :** (نێو زگ)منداڵێک پێی لە جووجکەیەک ناو پانی فلچی کردەوە . جلق و فلقی دەرهێنا .

**جلقێ و فلقێ :** (شوێنە ونکە )
جلقێ داتبە کێ
دام بە فلقێ

فلّقیّ دات بە کیّ
دام بە جلّقیّ
"فۆلکلۆر"

**جم وجۆلّ:** (جوولە) دەبیّ زۆر بە هێزو ورەوە قۆلّ لە کار هەلّمالّین .وداوێن بە لادا کەین و هەلّکوتێینە سەر کار. بێتوو جم و جۆلّمان نەبیّ و دەستە - وەستان و تەوەزەل بمێنینەوە، تووشی زەرەر دەبین.

**جوان و جحێلّ :** (تازە لاو) بە پیاوی جوان وجحێلّ هێلکەی لە باخەلّیدا دەکولیّ !

**جوان وچەلەنگ :** (نەشمیل)) ژنێک جوان و چەلەنگە کە چاو بە کل ، پشتێند شل زا زاوەچل و بەرموور لە مل بیّ .

**جوان وقازاخ:** (بەپوختی) کار وباری خۆم جوان و قازاخ بە - رێوە دەبەم منەتیشم بە کەس نیە.

**جوان ولەبار :** (لە بەردلاّن) دیمەنی دەشت و چیا کاتی بەهار، جوان و لە بارە . فەو کیژۆلە جوان ولەبارە .

**جۆش و خرۆش :** (جم و جۆلّ) کاتێک نۆرەی وتار بە کاک سیامەند گەیشت غەلّەبایی و جۆش و خرۆش کەوتە نێو خەلّک .

**جۆ و جۆبار :** (ئاوی جاری) ئاشکێرێک ئاو لیپاو لیپ بەو جۆو جۆبارەدا دێتە خوار ،
هەر جۆگە و جۆبارێ کەوا سوورو سوێربیّ
جیّی جۆششی گریانی منە، خوێنە رژاوە
"دیوانی نالی ل ۳۵"

**جووت و گا :** (کەرەسەی کشت و - کالّ)
کشت وکالّ و جووت و گامان
دێتە سەر باری لە بار
پیر دەبیّ تێرو جەوالّ و
مشت دەبیّ عەمباری کورد
"تاریک و روون ل ۱۲۵"

**جەرگ و دلّ :** (نێو زگ) هەتیوە هێندێکت حەیا هەبیّ . بسا هەلّنەستم پێلاقەیەکت پێدا دەم جەرگ ودلّت بە زاری دا وەدەم رخەم !

**جەرگ و سیپەلک :** (نێو زگ ) جەرگ و سیپەلکی ئەو مەرە نەخۆشە، رەش بووە .

**جەرگ و هەناو :** (دەروون)
کچ نووری دیدە و چاومن
بەندی جەرگ و هەناومن
"نالەی جودایی ل ۴۷"

ئەی لاوی کوردی نووری دووچاوم
قووەتی دلّم ، جەرگ و هەناوم
"دیوانی مەلاحەممەدی کۆیی"

**جەڕوومەنگەنە :** ( شت ) زۆر شتی بە روالەت ساکار،

ئامرازی جۆرا جوری تێدایــە و ئەوەندەی جەڕپو مەنگەنــە هەیە پیاو سەرەدەری لێ ناکا!

**جەڕپو مەنگەنە** :(وەحەولەوەلاخستن) قەرزدار خستمیە جەڕپو مەنگەنە .

**جەمع و جیهەت** :(تەنیا ،فەقەت) سەر جەمی شیعرەکــانــی ئەم شاعیرەم خوێندۆتەوە جەمـع و جیهەت چوار شێعری تێدا بـــە دلم نەبێ . ئەویدی بـــاش و رازاوەن .

**جەم و دوو نان** :
ئەگەر رەمەزانە وئـــەگــــەر شەشەکانە ، بەشی من هەر جەم و دوو نانە . "فۆلکلۆر"

**جەم و دەم** :(وەخت و سەعات) دەبێ ئادەمیزاد لە ژیانی دا جەم و دەمی هەبێ و لە خۆوە کاران نەکا . هەر کارە وەختی خۆی هەیە و هەر قسەیە جێـــی خۆی هەیە .

**جەنگ و جیدال** :(شەڕ و دەعوا) خاو و خێزانی هێندێک مــالان پێکەوە ناحاوێنەوە بەربینــگ یێک دەگرن ،شەڕو هـــەللا و جەنگ و جیدالیان لە مالدایە.

**جێ و بان** :(راخەرویێخەف) ئەو پیاوە ماوەیەکە نەخۆشە . بە جێ وبان کەوتووە . بنـــا بچین سەرێکی لێ بدەین .

**جێ و رێ** :(جێگا )چون دەمزانی جێ و رێیان نیە شەو لـــــە مالیان نەماوە .

**جێ و رێ** :(جێگا )چوومــە لای ئاغا بەلکوو جێ و رێیەکـــم بداتێ بچمە دێیەکەی ئەو .

**جێ و مەکان** :(جێگا ) بەو جێ و مەکانەی داێکمیچووەتـــێ دروٚ ناکەم .

لێت دەستێنم ئیمانە ،
بە جێ بهێلـــی
ئەو جێ و مەکانە
"بەیتی شێخ سەنعان"
چۆن رێی دەچێ کە رێی بێگانە بکەوێتە ناو ئەم جێ و مەکانە
"پیرەمێرد ل ١١١"

**جیرە و مواجب** :(هەق) نۆکەری بێ جیرە و مواجب نانجـــی سەری ئاغایە .
"گفتی پێشینیان"

# پیتی ( چ )

**چاپ وگووپ :** ( درۆ )
زۆری وا هەن خۆهەڵدەکێشن، بەڵێنی وادەدەن کە بۆیان سەروبەر ناکرێ وبۆخەڵک روون دەبێتەوە کە لە چاپ و گووپ زیاتر هیچیان لە بارا ندانیە .

**چادروچیغ :** ( رەشماڵ )
بانەمەڕێ لە هەواران چادرو چیغ هەڵدەدرێن .

**چاک وپیر :** (پیاوچاک )
سەد چاک وپیرت بۆ
دەخولێمەوە
لەبەر سێبەرت بحەسێمەوە
(بۆکوردستان، ل ١١٣ )

**چاک وخراپ** ( بەتیکرایی )
چاک وخراپی وەبەردا وکەسی نەهێشت .

**چاک وخۆشی :** (ئەحوالپرسی )
چاک وخۆشیم لەگەڵ کرد و داوای قەرزەکەم لێکرد
چاک وخۆشی لەگەڵ ئەستێران
کرد
کەوتە خۆوبووکی زەمینی
جوان کرد
(بۆکوردستان ل ١١١ )

**چاکە وخراپە :** (کردەوە )
هەرکەس چاکەوخراپەی خۆی بۆخۆیەتی
بەزگێک تێروبەدووزگ برسی،
هیچ لەچاکە وخراپە ناپرسی
(دیوانی مەلای کۆیی ل ٩ )

**چاوچڕ :** (هێزی دیتن)
وەرە ئەو دەزووە پێوەکە چاوچڕی من بڕوەی نابێ .

**چاوودڵ :** ( گیان )
چاوودڵمان روون میوانەکان هات .

**چاووڕاو :** (شایعە )
بۆژۆیە لام چاووڕاوت
دەتۆپی وناکەومە داوت
(بۆکوردستان ل ٦٦ )
وای گرتنەبەر چاووڕاوان
هەرهێندەبوو شێت نەبوون
لە تاوان !
(مەم وزین ل ٤٠ )

**چاووڕوو :** ( حەیا )
ئەم چاووڕووزە هەرئی خۆتە بێ .

**چاووزار :** (لەچاوچوون)
چاووزاربەردی دەقەڵشێ !
(گفتی پێشینیان )

**چاووگوێ :** ( هۆش )

منداڵ هەتا پتر گـــەورە
ـەبێ چاووگوێی پتردەکرێتەوە

**چڕوبەندەن** : (جێگای سەخت)
هێندێک کەس وەچڕوبەندەنی
کێوان دەکەون،چیلکە وچاڵـــی
وەخڕدەکەن وچای پێ سازدەکەن

**چڕوکێو** : (شاخ)
یەکجاری فرێت دا چارشێو
ئەوەرووت کردە چڕوکێـــو
(تاریک وروون ل ١٤٣)

**چڕوهەڵەمووت** : (تەلان)
ئەم شاخە چڕوهەڵەمووتێکە
سزنی پێ هەڵناگەڕێ،هەزار بە
هەزارێکە پیاو بکـــــــەوێ
هەرروون بە هەپروون دەبێ .

**چک وپک** : ( دووبەری جگ )
وەختێک جگی پەل دەکــــەن
چک و کی زۆرتر دێنێ .
ئیوهی سە ،تەوغی یە،شە گگە
وچک وپک
(ئۆکوردستان ل ١٢٥)

**چل وبڕ** : (هاتنەوەی باڵندە)
چل وبڕهاتەرە لەگەرمێنێ
خەبەری دۆستەکەم لـەبــۆ
دێنـــێ
(هێمـن )

**چل وملـ** : (بەسەردا سەپاو)
مەڕ کەبوو بەچـــل
دەبێ بەچل وملــــــ
(گفتی پێشینیان)

**چلک وچەپەر** : ( پیسی)
ئەسپۆن بە چاکیشتی پاک و
خاوێن دەکاتەوەوچلک وچەپەرێ
لادەبا .

**چڵ وپۆپ** : (لکی تازەی دار)
بەهاران چڵ وپۆپی داران،
بە گوڵ دەخەملێن.پیاو نابێ
بیانشکێنێ .

**چوست وچالاک** :
هەموویان تونددوتۆڵ وگورج
وگۆڵ وچوست وچالاکـن.
هەموویان بێ فروفێڵ وبـە
کارو سادە وپاکـــن
(تاریک وروون ل ٥٩ )

**چۆل وبەڕی** : (قاقڕ)
دەت نێرنەبەر بەرازانە
لەچۆل وبەڕی وبیابانــە
سەبارەت بەمنی جانانــە
(بەیتی شێخی سەنعان)

**چـۆل وبەندەن** : (بیروون)
وەک سیامەندی لە چـۆل ز
بەتدەنێ
جەرگی لەتکردم پــەلـــی
دارەبەنێ
(شاڵەی جودایی هێمن)

**چۆل وبیابان** : ( قاقڕ )
لەو چۆل وبیابانە،دەبــێ
یاوەری کێ بێ!
یان لەو کەژو کێوانـــەوە
سەوداسەری کێ بێ

(دیوانی بێخودل٦٦)

**چۆل ودەشت :** (دەشتی وشک)

هەردەپێوم کێووشاخ وچۆل

و دەشت

دێم بەرەو کوێستان بەرەو

باغی بەهەشت

(نالەی جودایی ل ٢٣١)

ئەگەر سکۆڵ دەکەن لەو

کێوودەشتە،

دەلەرزێ گایەکەی هەردی

لە پشتە

(شەرەفنامە، ل ٥٣٥ )

**چۆم وئاو :** (رووبار)

بنەرووخان وسیپە چۆل و

هۆلن

بلاون راوکەرو بالندەپۆلن

(تاریک وروون ل ١٤٤)

**چووک و گەورە :** (ئاڵ وگۆڕ)

ئەو ژن بەژنە چۆن کرا

چووک وگەورەیان پێ کردن.

**چەپ وچیر :** (خوارو خێچ)

ئەو سەندەڵی‌یە چەپ و

چیرە چیەو،فرێی بدە .

داوای قەرزەکەم لێکرد لێم

چەپ وچیربوو رەختبوو بمخوا

**چەق وپەق :** (گۆشتێکی بۆخواردن

نەبێ)

چوومە لای قەساب، لە باتی

سەلتە ونەرمە، چەق وپەق و

چەقالتەو ئێسکی دامێ .

**چەق وتەف :** (جەنگە)

لە لایەک باران دەباری، لە

لایەک منداڵەکەم نەخۆش بوو،

لەو چەق وتەفەدا دۆستەکەم

دەیگوت بچینە میوانی .

**چەق وچۆ :** (نۆبەتێ)

پێ یەوە هەزار ئازار و

ئاهۆ

کۆخەوهەلامەت، لەرزوچەق و

چۆ

(تاریک وروون ل ٥٧ )

**چەق ولوور :** (وەڕینی دەستەیەک

سەگ)

گەماڵ دەکەن چەق ولوور

سەوەڕیان دەچێ بۆ دوور

(تاریک وروون ل٥٨)

**چەقەوبنێشت:** (شتێک بنیادەمی

بەرنەدا)

وەک چەقە وبنێشت پێمەوە

نووسابوو بەری نەدەدام .

**چەقە وگوڕڕە :** (هەڵلا هەللا)

بەیانان لە بازاری چەقەو

گوڕەیەکە پیاو مێشکی دەری

دەچێ .

**چەک وچۆڵ :** (سلاح)

لە شەری دمدمدا، شای سەفە-

وی بەزەبری چەک وچولیکی زۆر

توانی قەلا بگرێ .

(عالەم ئارای عەبباسی ل٥٥٢)

**چەنگ ونینۆک** (هێزی دەست )

هێندە مەڵێ چەنگ ونینۆکم
بە شیووکۆڵ چوو،جل شۆڕێکت
بۆ دەکرم .

**چەوت وچێڵ** : ( نا راست )
ئەو پیاوی سووک وهەرزە دەڵێن .

بێ گفت وبەڵێن وچەوت و
چێڵن
بڕیار ئەوە بوو بەجێم
نەهێڵن

**چەوروچڵنیک** : (پیس)
جلکی ئەو شاگردمکانیکە
چەورو چڵنیکە .

# پیتی (ح)

**حاجەت وحوجەت**: (کەرەسە)
لەو ماڵەی حاجەت وحوجە-
تێکی زۆر هەیە

**حازرو بزر**: (ئامادە)
ئەو کتێبانەی داوات نەکردن
حازرو بزرن .

**حاڵ وباڵ** : (وەزع)
کوڕە چۆنی ؟ حاڵ وباڵت
چۆنە ،لە حاڵ وباڵی من هەر
مەپرسە .
یانی نە ملکم وماڵەلەبۆمە
نە حاڵ وباڵ
بێ جاه وبێ جەلال وبەبێ
حاڵ وبێ سەلا

**حدوودوکەحلان**: (چەند ئەسپی
ڕەسەن)
سواری حدوودوکەحلانان
بوون وچوونە ڕمبازی .

**حەرام وتورام** : (ناڕەوا)
ماڵی حەرام وتورام لە
چڵکی سەگی پیس ترە .

**حەلۆو جەلۆ** : (هیچ وپووچ)
بە ئینسانێ هەرزە

دەگوترێ،حەلۆو جەلۆ.

**حەلاڵ وزولاڵ :** (رەوا)

ئەو ماڵ وسامانەم ئـــــە رێگایەکی حەلاڵ وزولاڵەوە وەدەست هێناوە.

**حەلاڵ وهاوسەر :** (ژن ومێرد)

ژن وپیاو حەلاڵ وهاوسەری، یەکترین وناب ێ هیچ لێــــــک بشارنەوە.

**حەوزو کوفارە :** (حەوزی رازاوە)

خودا ئاوەدانی کا لـــــە قەراغ ئەو حەوزو کوفـــــارە رادەوەستم سەد لـــە ژووریَ خۆشترە.

**حەول ودەول :** (تەقەلا)

حەول ودەولێکی زۆرمدا تا ئەوکارەم جێ بەجێ کرد.

**حەیتە وحەکەدار :** (هەرزە)

بەژنی سووک وهەرزە بـــــا داوێن پیسیش نەبێ دەڵێـــــن حەیتەو حەکەدار.

**حەیف زمخا بن:** (بەداخەوە)

لەژێرپێدا دەچین حەیف و
مخابن

گەدابن ئێوە دوژمنتان بە
شابـن

(حاجی قادر کۆیی)

**حیزودز :** (خوێڕی)

خۆوەشێرن خوێڕی وقزە
بمرێ هەرچی حیزو دزە

(بۆکوردستان ل ٥٥)

**خێروسلامـەت :** (بێ دەنگ)

چم ئەو هەڵلاو بگرەی داوە لە ماڵە خۆم دادەنیشم حیز و سلامەت.

# پیتی (خ)

**خاک وخۆڵ :** (خۆڵی ورد)
خاک وخۆڵ ببووە گــرووی
گریانی
من چ خاکێک بــە ســەرم
دوردانی
(بۆکوردستان ل١٨)
مەسەلێکی مەشهورە گەرقوڕ
دەکەی بەسەرتا
برێژە خاک وخۆڵی دەرماڵی
گەورە مــاڵان
(حاجی قادرکۆیی)

**خانم وخاتوون:** (کابان)
خانم وخاتوون لە ماڵــی
خۆی دانیشتووە ،بـی کــەس
ناکا ،کاری بە کاری کەســەوە
نیە .

**خان ومان:** (نەشمیلانە)
دڵەکـوتەمنیە دڵـــم
جێی کیژێکی خان ومانە
(تاریک وروون ل١٣٤)

**خاوخێزان :** (بنەماڵە)
تریقە وپێکەنین وچەپڵەـ
ڕێزان
هەموو بەشداری بەزمــن
خاوخێزان
بۆکوردستان ل٢١٣

**خرت وخاڵ:** (تلتە)
کێشەی ناوێ.پالێورا وبۆتۆ
خرت وخاڵ بۆ من .

**خرینگ وهۆڕ :**
ئەوە چیە؟ هەر لێرە تـــا
خوراسان بە خرینگ وهــۆڕی
راسان ؟وەڵام : تەرزەیە .
(مەتەڵۆکەی کوردی)

**خرینگە ومەنگۆڵە :**
حەمایەل بازووبەندی قۆڵ
لوولەوقاش خرینگـــە و
مەنگۆڵ
(بۆ کوردستان ل ٥٣)
لەسەری ناوە خرینگە و
مەنگۆڵە
بە لەبزێ شیرین بانگ
دێڵێ زۆڵە
(گۆرانی)

**خڕوپڕ :** ( پتەو)
زەندی گۆشتن وشورش و
نەرم ونۆڵ
بەلەکی خڕوپڕوسپی و
سـۆڵ
بەژن بارک وخڕوپـــڕ
سەری کولمەیان دەیدا
گــڕ
(تاریک وروون ل١٩٩-٢٢٤)

مەمکت هەناری گمگمە
خڕوپڕی نێو دەستمە
(گۆرانی)

**خڕوخۆڵ :** (نەرم ونۆڵ)
چۆنی تۆ؟ چۆنە دەروکۆڵانت
دیمەنی بەرزوخڕوخۆڵانت؟
(بۆکوردستان ل ۱۱۹)
خانەقاوبۆدەکەم چۆلە
سەبارەت بەوخڕوخۆڵە
(سەیتی شێخی سەنعان ، بەندی (۲۱)

**خزم وئەقرەبا :** (کەس وکار)
پێشینیان گوتویانە :خزم و ئەقرەبا ئەگەر گۆشتی پیاویش بخۆن ئێسکی ناشکێنن
خزم وئەقرەبام بۆبانگ کەن
تەماشای خالی لەیلام کەن
( گۆرانی )

**خزموکەس :** (کەس و کار)
. هەرکەسەی ببوەکەوی دەس دوژمن
ئەیەویست،خزموکەسی خۆی قربن
"بۆکوردستان ل ۱۴۴"
خزموکەس وکار وهۆزوهاوال
یەکجێ هەموو بازی دابەرەو مال
"مەم وزین ،هەژار ل ۷۳"

**خشت وخال :** (پاشماوە)
کاتێک مالێ گەسک دەدەین و پاک وخاوێنی دەکەینەوە ،خشت وخالەکەی فڕێ دەدەین .جێ خەرەکان دەمالینەوە و خشت و خالەکەی بە بادەکەین .

**خواروخێچ :** (نالەبار)
چەند سالە لەگەڵ بێگارچیەکان ددانیتاق ووازکەوتووە و ئەوی ماویشنەتەوە ،خوار و خێچ بووە .
"پێکەنینی گەدا ،ل۳۲"

**خوارەکەو پێچەکە** ( لا بەلا )
وەختێک پیاو لەهەورازێک سەردەکەوێ ،نابێ راست لێیدا بەلکوو دەبێ خوارەکە و پێچەکەی بکا . بێتووخوارەکەو پێچەکەی نەکا ماندوو دەبێ ویشووی سوار دەبێ .

**خوت وخافڵ :** (ناکاو)
چاوەڕێم نەبوون خوت وخافڵ لێیان وەژوور کەوتم زۆر- یشیان پێ خۆش بوو .

**خوت وخۆڕایی :** (لەسەرهێچ)
هەرلەخوت وخۆڕایی وبە ناحەقی خەریکە فریوم دەدا
"کوێرەوەری،ئیبراهیم ئەحمەد ، ل ۲۲"

**خوداوڕاستان**
زۆرلەمێژ بوو لەمانای

وشەیەک دەگەڕام وەهـــوو قامووسێکم لەسەنگ وسووژن دا حوداوڕاستان ئەوروّمانا کــەم دیتەوە وحەسامەوە.

**خورد و ورد**: (کار جوان)
ئەو کچەلەکارکردندا هەلتە. باش وتەوەزل نیە، بەلکـــوو لەسەرەخۆ ووریا وخوردو وردە ومال ئاوەدانکەرە.

**خوێنوخور**: (خوێنی بەلێشاو)
گەوزی لەم شارە لەنێوخوێـــن وخـــــوڕ
بەسەدان پـیرومنـــال کیــــژ وکـــــوڕ
"هێمن"
لەبەرخوێن وخوڕدەشتی شــەڕ ببووەگـــۆم
لەتیران مەتال بوونەبێژنگی دۆم
"شەرەفنامە، ل ٧٣٠"
لەسەرئەوەراکەگۆشتەکەچاک شوشتبۆوە، خوێن و خوڕێکــی زۆری لەبەر ڕۆیشتبـــوو و جۆگەلەیەک لەوخوێن وخوڕ ساز ببوو.

**خوێن وکێم** (برین) هێندێک برین پاش ماوەیەکی بن دەگرن وهەلدەدەنەوە ودەتەنەوە و تەشەنا دەبنەوە، خوێــن و کێمێکی زۆر وەدەر دەنێن و درەنگ چاک دەبنەوە.
ئەوکوانەخوێن وکێمی تێدا یە وهەوای نەکردووە.

**خوێن وگۆشت**: (لەش)
بێشینیان گوتوویانـــە: بەهاران خوێن وگۆشــــت دەژێنەوە.

**خوڕەوخنخنە**: (مافەتە)
وەختێک یەکێک لەیەکێکـــی تووڕە دەبێ، جاری وا یە پێی دەلێ: بڕۆ هەی خوڕەوخنخنەی گری وبەو دەردەی ڕۆکەوی.

**خورەوماڤەتە**:
یەکێک لەو جنێوانە کەلـــە موکریاندا باوەوزیاتر بـــە مندالان دەگوترێ، ئەوەیە: دەک خوڕە ومافەتەت لێدا!

**خەت وخال**: (زەرقی)
لێز گەی دوڕ ولال وبەنـــدی گــەوهـــەر
بسک وخەت وخالی ڕەندی دلبەر
شەوبۆن و وەنەوشەو هــەلالان
بسک وخەت وخال بدەم بەتالان
"مەم وزین، ل ١٠٣و٤٥"
لەپرێ پەریەکی نازدا روشەپال ئاسکی، ناسکی شیرین خــەت و خـــال
"بۆکوردستان، ل١٤٢"
وەک بارەکەو خەت وخالـــی رشتووە.

**خەرج وباج**: (سەرانە)
لەسەردەمی پاشایەتـــی قاجاراندا ،حاکمەکانیشــارەکانی کوردستان بە پوولێکــی بەرێوەبەرایەتی ،ناوچەکانیان لەمەختە هەڵدەگرتەوە.جابــۆ ئەوەی پوول وپارەیەکی زۆرتر تەڵەکە بکەن ،خەرجو باجێکی زۆریان لەخەڵکی دەستاند .

**خەزوبەز**: (قەڵەوایی)
ئەو گیسکە هێندەقەڵــەوە هەر خەز و بەزە .

**خەست وخۆڵ**: (غەلیز)
لەمێژە ئیشتیام لـــە شۆربا وێکی خەست وخۆڵە .

**خەلەوخەرمان**: (جێخوون)
ئەمساڵ دەغڵ ودان بـــاش بوو.خەلە وخەرمان زۆر بوو .

**خەڵات وبەرات**: (باربوو)
چاوم لە خەڵات وبەراتـــی کەس نیە.منەت لەشان وباهۆی خۆم.

**خەموتەم**: (وەڕەزی)
جاری واهەیە خەم وتەمێکی زۆر بەسەر پیاویدادێو پیـــاو سەری هەموو کێوانی لـــێ تاریک دەبێ ،بەڵام‌زوو رۆژی ، خۆشیە هەڵدێ وخەم وتـــەم دەرەوێ .

من ودەماوەن شەرتێومان کەردەن
من خەم وئەوتەم تـــا وە وێ مەردەن
"گـــۆرانی"

**خەم وخەفەت** (پەژارە)
خەم وخەفەت لەش وگیـــان بێ هێزدەکا وپێش لە خۆشـــی دەگرێ .کەوابوو پیاو دەبـــێ خەم وخەفەت وەلابنێ .

**خەنەوڕەنگ**
ژنان خەنە وڕەنگ دەگرن . وە ولە سەریانی دەنێــــن تا بسکیان جوان بێ .

تاکوو پاماڵ بێ خوێنـــی مەزلوومان
پەنجەی شمشاڵت رەنـــگ وخەنەدە
"دیوانی سەیف ل ٣٤ "

سەرپەنجە لە رەنگی گوڵ دەرەنجان
رەنگ وخەنە چۆن لــــەوێ دەگونجان
" مەم وزیـــن،ل ٤٥ "

**خەو وخۆراک**(هەدادان‌وحەجمین)
ئەو کابرایە نەخۆشی یەکی وای پێوە نووسا کە خــەو و خۆراک وئۆقرەوحەجمینــــــی لێ هەڵگیرا .زۆری نەخایانـــد کەچاک بووە و وەک گوێــــزی

نێوە نێوە چۆل وگۆرایی و
دەشت وەبەر چاو دەکەوێ .
هەردەپێوم کێووشاخ وچۆل
دەشت
دێم بەرەوکوێستان بەرەوباخی
بەهەشت
"نالەی جودایی ل ۲۳"
ژیانم پڕلەرەنج ودەردوداخە
ئەوەگیرسامەوەلەوکێووشاخە
"تاریک وروون ل ۱۱۴"

**شادوشوکر** : (شادبوون)
لەمێژبوو کوێری ئەو
کابرایەی بێ سەروشوێن بوو و
کەس بەجێگای نەدەزانی.تاکوو
لەودوایی یانەدالەنەکاو
وەسەروسۆراغی کەوتن .بابی
پێی شادوشوکربۆوە .
... لەگەڵ هاوولاتانی
دلنیاو دلخۆش بەیەکتری شاد
وشوکربببنەوە ....
"کوێرەوەرێل ۱۰۲"

**شان وباهۆ** : (پیل)
لاو شوانە بە شان وباهۆ
زۆر خوێن گەرم وشایی بەخۆ
"تاریک وروون ل ۱۹"
لەشان وباهۆی خۆم رادی
هەلگرم ئالای ئازادی
" "

**شان وپیل** : (هێزی باسک)
تاکەی رەنجی شان وپیلم
بۆ دوژمن بێ،بۆمن دێلم ؟
"تاریک روون ل۱۸۹"
کەشەودا یمالێ پەنجەی،یاری
جوانی
بەرۆژباهەرجەدەوبێ بیلوشانی
"نالەیجودایی ل ۷۲"
وەسێتم کردووە بەشان وپیلی
تۆلەقەبرم نێن .

**شان وشکۆ** : (هەیبەت ،شان)
بنەمالەی ئەوکابرایەی زۆر
بەشان وشکۆن ورەسەنن ولە
نێوخەلکیدا رێزیان دەگرن .

**شان وشەپیلک** : (باهۆ)
دوو رۆژەشان وشەپیلکم
دێشێ وکچەکەم بۆمدادەمالێ .

**شان وشەوکەت** : (هەیبەت)
ئەوکابرایە ناوبەدەرەوەیە وبەشان وشەوکەتە .ئەوەندە
لەنێو دلیخەلکیدا جێی خۆی
کردۆتەوە ،کەسوێندی بەسەری
دەخۆن .

**شان وقۆل**: (چۆنیەتی قول)
ئەو چۆغەیە شان وقۆلی
برێک فشە .

**شان ومل** : (ئەستۆوشان)
زۆرکەسی واهەن فێری شان
ومل داماڵینن .
چیە ،چۆنە لەبەرتۆداجلی
رەش ؟
سەروشان وملت بۆنا وەتەهەش ؟

"تاریک وروون ل ٨٤"

**شانەوشان:**
ئەو شاردەزۆربەپێزەونانی
شانەوشانی لێ دی .

**شایی وشین:** (شێنەیی وتەنگانە)
خزم وکەسیی پیاوی دەبێ
لەشایی وشینداپیاوی
بخوێننەوە و بەسەری کەنەوە.
پیاوئەوپیاوەیە لەشایی و
شینی خەڵکی دابێ .

**شت ومەک :** ( کەرەسە )
دوێنێ چووبوومەبازاڕی ،
گەلێک شڕوشاڵات وشت ومەکم
کڕیو گەڕامەوە .

**شرت وشۆ:**
ئەوکابرایە ئەوەندەیجنێو
بەهاواڵەکەی داکەشرت وشۆی
شوشت !
هەڵگەڕاوەبەنازوگوڵ پێی
گوت :
شێت وشووری ،کەشرت وشۆمت
شوت !

"تاریک وروون ل ٨٨"

**شرت وگوم:** ( ون بوون)
بەدەستی خۆم کتێبەکانم
لێرەدانابوو. بەڵام لەوە
گەڕانەوەدا نەچوومەوە سەری.
شرت وگوم بووا
کێ زانی لەکوێ شرت وگوم
دەبم ؟

چوزانم گەردوون چم بەسەر
دێنێ
"بۆکوردستان،ل، ٨٦ "

**شریخ وهۆڕ:** (گرمەی لەپەستا )
دوێنێ شریخ وهۆڕی هەوران
گوێی پیاویان کەڕ دەکرد .
هەوران دەیانگرماند وشریخ و
هۆڕیان رێی رۆژێک دەرۆیشت

**شرودڕ:** (شەڕانی)
ئەوکابرایە مەند ولە
سەرخۆنیە .بەڵکوو بەپێچەوانە
شڕودڕە .کەس پیاوی شڕو دڕی
خۆش ناوێ ولێی لادەدەن تا
نەکا وەک سەگی هار پێیان
هەڵپرووسکێ .

**شڕوشاڵات :** (کەل وپەل )
دوێنێ ماڵی هەڵوەزارد .
ئەوکەل وپەل وشڕوشاڵاتەی
کە بە کارم نەدەهاتن وجێیلن
لێ گرتبووم ،وەلام نان و
وازم لێ هێنان .

**شڕوشۆڵ :** (کۆک نەبوون)
ئەوکابرایە کۆک وپۆشتە
نیە ، بەڵکوو بە پێچەوانە
شڕو شڕۆڵە .
هەر هێندە تکام لەتۆیە
رۆڵەم
مەڕوانە کەئەم شڕوشڕۆڵەم
"مەموزین،ل، ١١٨"
شاعیر عموم کەوتنە

مەقا مات وبۆڵە بۆڵ
مەدحی وەتەن دەکەن بـــە
قەسیدەی شڕوشـڕۆ ڵ
"مەلا مارفی کۆکەیی "
**شڕوور :** (دڕاندن وورد کردن )
قوتابی نابێ کتێبی لەبەر
دەست منداڵان دانێ ،دەنـــا
دەیدڕێنن وشڕووڕی دەکەن .
پەرژینی بەگوڵ بـێ دوو
کوڕم هەن
دوو بێکەسی زۆر شـڕو وڕم
هــــەن
"مەم وزین،ل، ٣٦ "
**شل وشەوێق :** ( نالەبار)
ئەو کابرایە بە جوانـــی
جلی لەبەر ناکا پشتێندەکــەی
هەمیشە لۆیەکی لە عـــەرزی
دەخشێ ویانتۆڵەکەی بـــــە
پتەیەکی لێ دەکەوێ ویـێـــچ و
کڵاوەکەی بە فوویەکی لێ بـەر
دەبێتەوە,کەوابوو زۆر شـل و
شەوێقە .
**شل وکوت :** (ئەخت وچار )
تێیدا شل وکوت بــــووم و
ئەختوچارم کردوتـــوێـــخ و
لوێخ چوو ،نەهاتە ژوور .
**شل ومل :** (ناسکو نازدار )
پشتێند شل ومل هەستـــــە
بەیانە
هەتا پێک دەبڕێین ئاخـر
زەمانە
"گۆرانـــی "
دڵتەڕ ،مەشرەف خۆش ،زاربە
پێکەنین
شل ومل ،ئەسمەر ،ناســک
نازەنیـن
پۆلێکی پەری شل ومـــــل
بەرموور وملوانکە لە مل
"تاریک وروون،ل٩٩ ا- ٢٢٣"
دینی بەرولەمبەری شل ومل
چاوی گەش وروون دەکرد بە
بێ کل
زینی شل ومل خراتەنیشتی
پێک گەینەوە دوو مەلـــی
بەهەشتی
قامیشی کلۆڵ لەقامیشاوا
دەژیام شل ومل لەشینک و
ئاوا
"مەم وزین،ل،١١٥،١٠٤،٢٢٠"
**شلـپ وهۆڕ :**
وەختێک گامێش خۆی بـــــە
گۆمێ دادەکا ،شلـپ وهۆڕێکـــی
زۆر دەبیسرێ کەوەک شلـپ وهۆڕی
باقۆی دەچێ لە کاتێکیـــــدا
کە بە قولاپ لە گۆمێــــــی
دەردەکێشن .
**شلەوقۆڵە :** (دەست وپێوەند )
جاری واهەیە کابرا یـــەک
دووسێ کەسان بۆماڵی خـــۆی
بانگ دەهێڵێ .ئەو دوو ســێ

کەسانەش یەک دووکەسی دی
رەگەڵ خۆیان دەخەن ووەژوور،
خانەخێو دەکەون .بەو یەک
دوو کەسانە دەگوترێ شلە و
قولە .دیارە شلەوقولە بێ
ئەوەی بانگ هێشترابن زگی
خانەخێو دەشێلن .

**شۆخ وشەنگ :**

لالە هەباسی شۆخ وشەنگ
تافتەی لەبەردا بە حەوت
رەنگ
ئێستەکەش بۆگەپ و بەزم و
ئاهەنگ
دێنە لاتکیژوکوڕی شۆخ و
شەنگ ؟
"بۆکوردستان"

خوایە مەدە دەستی پەیاوی
لاسار
ئەو دڵبەری شۆخ وشەنگ و
نازدار
ئەو دووگوڵە شۆخ وشەنگ
وجوانە
هاتبوونە جیهان هەواڵ
دووانە
"مەموزین،ل،٩١ـ ٢٢"

ناسک ونازدار وشۆخ و
شەنگ
تەنک وشلک وجوان و
چەلەنگ
"تاریک وروون،ل٢٢٤"

بە حیلکان وچەپلەی کچی
شۆخ وشەنگ،
نە پارێز وترسان نە روو
مانەرەنگ .
"شەرەفنامە ،ل، ٧٣٩ "

**شۆخ ولەبار :( قۆز)**

ئەوکچە چکۆلە ناشیرین و
نالەبار نییە ،بەڵکوو شۆخ و
لەبارە .

شۆخ ولەبار وجوان و رەزا
سووک
لەراست رووی دەچوو
ئابڕووی گوڵتووک
"تاریک وروون،ل، ١٩٩"

**شووش وباریک:**

زۆربەی شاعێران لە
شێعرەکانی خۆیاندا باسی
گراوی شووش وباریکیان
کردووە .داری قەنەنەی ئاوی
گرنی وئەستوور نییە بەڵکوو
بە پێچەوانە شووش وباریکە .

بەدەستێکە پڕلەبازن،
بەقامکێکە شووش وباریک،
هەڵدەسێتەوە سەرلانکی گوڵێکی
دە دوودینە "بەیت"

**شەتڵ وشەلاڵ:( لەخوێن گەوزاو)**

کاتێک کابرا یەک لە
شەڕێدا دەنگوێ وبریندار دەبێ
بێتوو زوو پێی رانەگەن
شەتڵ وشەلاڵی خوێن دەبێ

و زۆری پێ ناچێ کە ئەوەندەی خوێن لەبەر دەڕوا ،کە دەمرێ. لە شاخی راهەڵدێرا ، شەتڵ و شەلاڵی خوێن بوو!

**شەدەوکێلکێلە :**
ژنەبلباسی وەختێک شەدە و کێل کێلەی لەسەر دەبەستن ، زۆر لە بارن .

دەسماڵ پووڵەکە دارن
شەدەوکێلکێلـــــــە لارن
"تاریک وڕوون،ل،١٠٩"

**شەرت وشوێن :** (قەرارومەدار)
کاتێک شوانکارەیەک بڕیار دەدا چەند سەر مەڕ بــــۆ کابرایەکی بەخێو بکا ، لـــە نێو خۆیاندا شەرت وشوێنێکی دادەنێن .

ئەورۆ شەرتوشوێنم بۆ تــۆ دانا :
دەت نێرمە بەر بــەرازان
"بەیتی شێخی سەنعـــــان
بەندی ٤٨ "

**شەرموحەیا :** ( ئابڕوو )
ژنی بەشەرم وحەیا لە نێو کۆمەڵدا پەسندە .

بەدڵی سادەوبەهەستیپاکت
بەشەرموحەیا وئاکاری چاکت
"تاریک وڕوون،ل،٦٤"

**شەرموشوورەیی :** (حەیا وئابڕوو )
وەرە پێشێ ماڵە خۆتـــــە شەرم وشوورەیی ناوێ .

**شەریک وبرابەش:** (هاوبەش)
وەختێک گەورەی ماڵێکـــــی دەمرێ،میراتگرانی وی لـــــە بەرئەوەی شەریک وبرابـــەشـــن میراتیان پێ دەبرێ .

ئەو کابرایە ئەوەندە خـــــۆ رێخەرو بێ چاووڕووە ، لە گەڵ هەر کەس خۆی دەکاتە شەریک و برابەش .

**شەڕوشوڕ :** ( کێشە )
تەبایی وهێمنی زۆرچاکترە لە شەڕوشوڕ .

**شەڕوکێشە :**
دوو کەسکە پێکەوە دوژمن بنشەڕوکێشەیان دەبێ وخەونی گولیە بە یەکتریەوە دەبینن .

**شەڕونێوەشەڕ :** ( کێشە )
شەڕونیوەشەڕ هەر یەکێکە .
"گفتی پێشینیان "

**شەڕوهەڵلا :** ( کێشەوبگر )
لەوماڵەی هەر چەقـــــە و شەڕوهەڵلایە وقەت هێمنـــــــی لەو ماڵەیدا نابیندرێ .

تابەری بەیان شەڕوهەڵلایە،
هەرکێچە وبۆمن دەس بـــــە تێلایە .
"بۆکوردستان،ل،٢٢٣ "
چەند خۆشە شێتی ئەستـــــۆ بەرەڵلا

دوور لەناکەس ولە شەڕو
هەلـلا
"پیرەمێرد ،ل ، ٢٣٨ "
**شەش تەقەڵ ومانگە شەو :**

ئەو لێفە درووە بە
چاکی لێفەکەی نەدرووە . هەر
شەش تەقەڵ ومانگە شەو
وبوزوچرێش درووپەتی و
داوێتەوە بە ئێمە .

**شەش وبێش :** (بۆ بەرژەوەند)
جاری واهەیە لەنەردێنێدا
شەش وبێشێکی بهێنین،دەبیە ـ
ینەوە و دەنادەیدۆڕێنین
بۆ بەرژەوەند ،شەش وبێش
پێی دادەدا ،بۆیە واخاوێنە !

**شەق وپەق :** ( کوت کوت )
جەردەکان،کاروانچی یان
شەق وپەق کردبوون .

**شەق وشڕ :** (داکەوتوو)
ئەو دەرکەیە ئەوەندە
کۆنە ،لەق بووە وشەق وشڕە .
دیتیان یەکی پیرە
هەڵتروو شکاو
وەک لانکی شڕۆڵ شەق وشڕ و
شکاو
"مەم وزین،ل، ٣٨ "ـ

**شەل وکوێر :** ( دەردەدار )
لەنێو ئەو کەسانەی کە
بانگ هێشترابوون،یەکێکی
ساغ بەرچاو نەدەکەوت .هەموو
شەل وکوێر ،کەرولاڵ، نەخۆش و
سەرئێش ،ناساز ودەردەدار بوون !

**شەل وگێر :** (نەساغ)
پیاوی شەل وگێر لەش ساغ ،
نیە .
پێخواس وبەکەوش ومیر
وشاشێر
سەربەرزونەوی وبەپێ شەل و
گێر
"مەموزین ،ل، ٦٥ "

**شەندەومەندە :** (وەک یەک چوون)
بێتوو براکەم رانبک و
چۆغە یەکت باربوو بکا منیش
پێچ وکلاوێکت باربوو دەکەم .
خۆ شەندە لەمەندەی کەمترنیە
شان بەشان دەس لە دەستا
گوڤەندە.
رێکی یەک دێنەوە شەندەو
مەندە
"بۆکوردستان "

**شەنەوبێل :**
وابلاو بۆتەوە بە شەنە و
بێلان کۆنابێتەوە !

**شەولەک ودەولەک:**
باب ودایک بوونە شەولەک
ودەولەک .بوپێک هێنانی
ژیانی باش وخۆشی منداڵەکا ـ
نیان خۆیان ماندوو دەکەن و
لەهێچ مەترسی یەک

تاپرینگێنەوە .شەوورۆژ بیر لە منداڵەکانیان دەکەنەوە و هەڵدەسوورێن وقنیـــــات و ئۆقرەیان لێهەڵگیراوە . بە راستی شەولەک ودەولەکن .
بودا بین کردنی بژیوی ئەم رەش ورووتانە،بوومە شەولەک ودەولەک .

**شەووشەونخوونی :**
دایک شەووشەونخوونی لە سەر منداڵەکەی دەکێشێ و زۆر جاری واش هەیە هەر نانوێ .
نەدی شەووشەو نخوونی
نە چێشتی دەردی نەبوونی
"تاریک وروون،ل،١٨٩"

**شەووگورد :** (ئامرازی جۆلایی)

**شەیتان وشۆفار :** (پیاوی خراپ )
ئەوکابرایە ئەوەندە چاکە هەر دەڵێی پەپوولەیە.بەلام براکەی بە پێچەوانەی خـۆی، زۆر شەیتان وشۆفارە .
شەیتان وشۆفار ودمدراوبوو
سەگ بێزی دەهات ئەوەنـد گلاو بوو.
"مەم وزین،ل ، ٥٢ "

**شێت وشوور :** ( دێوانە )
هەڵگەراوە بەنازوگـــول
پێی گوت
شێت وشووری کەشرت وشۆمت
شـــووت

"تاریک وروون،ل٨٨"

**شێت وشەیدا** (گیرودەی ئەوین )
شێت وشەیدا بوو ،هۆشـــی
نەما بوو
ئاگای لە حاڵی خۆشـــی
نەما بوو
"تاریک وروون،ل،٢٠١"
شێت وشەیدا وسەحرا یـــی ،
دەگەڕێم هەروەکوەفایی،
چ بکەم لەودڵەی سەودایی،
پەریان دەستیان لێ داوە.
"وەفایی "

**شێت ووێت :** (ئاقڵ سووک )
براکەت ژیرولەسەرەخۆنییە بەڵکوو بە پێچەوانە شێت و وێتە .ئەوکورە شێت ووێتی فڕی بە دنیاوە نیە .
منت کردووە شێت وێتـــی
خۆت
وەختە لەسوێ یان گیانــم
دەرچێ بۆت
"تاریک وروون،ل،٦٤"

**شێت وهار :** ( بێ ئاقڵ )
ئەوپیاوە ژیرولەسەرەخۆیە بەلام وەختێک هەواڵی مردنی کوڕە جوانەمەرگەکەیان پێدا ، گۆڕا وبوو بە پیاوێکی شێت و هاری وەها کە دەستی لـــە خەڵکی دەوەشاند . خـــودا ئەو رۆژەی بە کەس نیشـــان

نەدا .

**شێخ ومەلا:** (پیاوی بەمشوور)
یانە بمکۆژە یادڵنیام کە
بەس دەستە وداوێن شێخ و
مەلام کە
"گۆرانی"
سجووق ومێوژ وهەنگوینی
شانە،
مەلا وشێخیان دەختە سەر
بەهانە .
"شەرەفنامە ،ل،٧٥٥"

**شێروخەت :** (جۆرە کایەیەکە)
جاری واهەیە دوو یا چەند
منداڵ بۆکایە وقومار شێرو
خەتی هەڵداوێن ،شێر بۆ هەر
کەسێ هات دەبێ ئەو کەسە
پێش دەستی بکا .
– رۆڵە ئەوە چ دەکەی ؟
– بابە گیانە گەڵ ئاوا–
ڵەکەم شێروخەتی دەکەین .
– جارێکی دیکە شتی،
وابکەی خراپت پێدەکەم .

**شێروورێوی:** (قسەی پووچ)
پیاو وەختێک قسەی بۆ
یەکێکی دەگێرێتەوە دەبێ
هەر مەبەست وکاکلەکەی بڵێ و
هێندەی شێروورێوی بۆ
نەهێنێتەوە .
هێنایەوە هێندە شێروورێوی
رازاندیەوە پیس دڵۆ و
دزێوی
"مەم وزین،ل، ٨٦"

**شێووەرد:** (شی کردنەوە)
ئێگەیشتم .دەڵێی چی .
دەبەسی شێووەرد بدەوە .

**شێروتیر:** (ئامرازی شەڕ)
شەیتان لە قیامەتدا روو
لە ئادەمیزاد دەکا ودەڵێ :
شیروتیرم پێ نەبوو بۆ بە
قسەت دەکردم ؟
کە گەردوون چاکی لێ کردی
بەلادا
کەمەند وشیروتیرت بەهەرە
نادا
"شەرەفنامە ،ل،٧٢١"

**شێرەوگەرم:** (شیرەوتێن)
ئەو ئاوە ئەوەندە گەرمە
کە وەختی کوڵینێی بێ نە
زۆر ساردە پەڵکوو شیرە و
گەرمە .

**شین و رۆ رۆ:** (واوەیلا)
هەرچی دەی بینی دەست بە
ئەزنۆیە
لە هەموو لاوە شین و
رۆرۆیە
شین وگریان ورۆرۆ بوو
پیشەی،
هەر بیری ئەوبوو یادی
هەمیشەی .
"تارێک وروون،ل،٤٠ ،٢٠١"

**شین ورەش :** ( زۆرکوتان )
هەر بە خەسووم بگاتـــەوە
شین ورەشم دەکاتـــــەوە
"کاروانی خەیاڵ، هێدی "

**شین وشەپۆڕ :** (شین گێڕان)
شین وشەپۆڕەلەنێورەعیەتی
بەبا چووهەموو سـەعـی و
زەحمەتی
"دیوانی سەیف "
بۆوە شین وشەپۆڕ لە نـاو
جووانان
هاوار دەگەیشتە عاسمانان
"مەموزین،ل٨٢،٩٠

**شین وگابۆڕ:**
وەختێک تەرمی کورەکەیان
هێناوە ماڵێ باب وداپیکەکەی
وەشیمەتلەشین وگابۆڕیان
داوبە بانگ وسەلا بـــۆی
دەگریان .ئەوشین وگابـــۆڕە
تا ماوەیەکی، درێژەی هەبوو!
بە بیستنی ئەو شین وگابۆڕە
پیاو ئاوری بۆیان تێ بەردە-
بوو .

**شین وگریان:** ( شیوەن)
لەوماڵەی کە مردوویـــان
لێ مردووە ،دەنگی شین وگریان
دەبیسترێ .
دڵیان بووبە ئاهی سـەردی
بریان
ویستیان بەسی کا لە شین و
گریان
"مەموزین،ل، ٥٥ "

**شێوودۆڵ:** (جێی ڕژد)
کاروانێک شەوێک لــــــە
چۆڵێکا
بنەیان خستلە شێـــو و
دۆڵێکا
"بۆکوردستان،ل، ٢٣٣ "
بەبەرگی سەوز رازاوە قەد
ولاپاڵ وشێوودۆڵ
چرۆی دەرکردووە دارومل
دا یەکتری گیاوگۆڵ
"تاریک وروون،ل٨٦ "

**شیووکوڵ:** (جل شووشتن )
ئەوژنەمێردەکەی مردووە و
شیووکوڵی بۆماڵان دەکاو لـەو
ڕێگایەوە خۆی ومنداڵەکانـی
بەرێوە دەبا .

# پیتی (ع)

عومرومالّ: (تەمەن وداهات)
یەک بە یەکی دەلێ:
چۆنی ؟ چاکی ؟ ئەوی دیش
لە ولامیدا دەلێ :چ بکەم
دوعا بۆعومرومالّت دەکەم.
خودا راوەستاوت کا.
عەڕش وقوڕش : (عەڕش و کورسی)
ئەونەی ئەزانی شەیتان
نایەوێ
کوێخایی عەڕش وقوڕشی
بەرکەوێ
"دیوانی پیرەمێردل٢٣١
شێخ عەلی : ئاگام لە عەڕش و
قوڕشە ،کێت دیوە بە دۆی خۆی
بلێ ترشە ؟
"پیرەمێرد ،ل، ٢١٣ "
عەڕش وکورسی: (هەموو جێ)
هەر لەعەڕش تا کورسییە
هەرلە کورسی تاعەڕشییە
پەنام ئەتۆی ئەی ڕەبییە
"فۆلکلۆر"
من لە پاتەختی پاپەتی
وبرسی
تولە سەماوات لای عەڕش و
کورسی
"بۆکوردستان،ل، ٢٣ "
عوزرو بەهانە : ( بیانوو )
هیچ بڕوبیانووم لێ دامە-
نێوە ،بێعوزروبەهانە دەبێ
لە گەلّم بێی .
قسێکت بۆشەکەم چاکی بزانە
قوبوولّی کە بە بێ عوزر و
بەهانە
"دیوانی مەلامحمدی کۆیی،
ل، ٢٣ "
عەقلّ وماریفەت : (مشوور)-
بێتوو پیاو عەقلّ و
ماریفەتی هەبێ بە مشوورە
وجێی رمبی دەکاتەوە ، ئەو
جار رمبی دەچەقێنێ و کاران
دەبنە دەکا ،کەرونشکی بە
عەرابەی دەگرێ . بە
پێچەوانە پیاوی بێ عەقلّ و
ماریفەت هەر پێیدا دەدا وبە
مشوور نییە ،کەمتەر خەمە و
یەکی بە هیچ کاران نەکەوتووە
عەنتیکەومەزەدار : (هەلّکەوتوو)
کچی جوان وشۆخ وقیت و
قۆزم زۆر دیون، بەلام
هیچیان وەکوو ئەوەی عەنتیکە
ومەزەدار نەبوون .
ئەو کچە چەندە لەبارە
عەنتیکەو مەزەدارە

**عەیب وعار :** (شەرم)

یەک بەرگن و یەک زمـــان و
یەک رەنگ
بێ غەیبەت وعەیب وعـــار و
بێ دەنگ
"دیوانی حاجی قادری کۆیی

وەرزش،زۆرانی دەگەڵ یەک
دەگرن
عەیب وعارنیە ،نابێ تێـک
فکـرن
"دیوانی سەیف ،ل ٥٨"

**عەیش ونۆش :** (خۆش رابواردن)

بەخودای،وانابێ شەرتـــی
دڵداری
تۆلەعەیش ونۆش من لـــــە
خەمباری
"گۆرانی "

لەهەر لایێ دەڵێن هــــەر
عەیش ونۆشە
هەزار خۆزگەم بە میوانــی
دەرو ژوور
"دیوانی سەیفەل، ٦٢ "

**عینجەوفینجە :** ( ناز )

بۆئاوا بەعینجە وفینجە دەرۆی

# پیتی (غ)

**غەوروخەوش :**

نەوەک لێ دا خرابا دەرکی
حەوشە
ژیلابایە لە نێو ئەو غەور
وخەوشە
"نالەی جودایی،ل، ٦٥ "

دڵی من لەحاندی تۆهیچ غەورو
غەشی نیە . وەک ئاسمانی‌سنا و
روونــە .

# پیتی ( ف )

فرت وفرەوا ن: (زۆروزەوەند)
لە مانگی گەلاوێژدا سێو
فرت وفرەوانە وبەلاشە . بەلام
لە مانگی رەشەمەدا بە
پێچەوانە سێو دەبێتە شتێکی
ناسووغیودەچێتە پشتی
شێوان .
ـ کاکە مەزرایەکی فرت و
فرەوانم هەیە.وەرە بەشی
خۆتی شکارتە لێ بکە .

فرۆفێلۆ: ( دەهۆ )
هەموویان توندوتۆڵوگورج،
وگۆڵ وچوست وچالاکن
هەموویان بێفرۆفێڵ و بە
کاروسادە وپاکن
کیژی لادێیی نەشمیلی جوان
چاک
بێ فرۆفێڵ وهێدی وداوێن
پاک
"تاریک وروون،ل٥٩،٦٣"

فرۆفیسار: (شتی دی)
ئەوان وەک ئێوە ناخۆن
شەربەت وشەکراووپالۆدە
لەکوێ بێنن پلاووگۆشت و
خۆرشت وفرۆ فیسار؟
"تاریک وروون،ل، ٦٠ "

فرۆفیشال: (بەدرۆ خۆهەلکێشان)
ئەوکابرایە خۆی زۆر پێ
زلەوخۆی هەلدەکێشێ ولە فرۆ
فیشال بەدەر چیدیکەی نیە .
چەند خۆشە هەر کەس هەر بەو
جۆرەی کە هەیە خۆی بنوێنێ
وبناسێنێ وفرۆفیشالی نەبێ .

فرۆفیک: ( نەزم )
فرۆفیکی تۆ بەو رۆژە،
ناخۆشەی گەیاندووم .
فرۆفیکی ئەوە گرتی
هەموومان
لە داخانی دەبوو بگرین
هەمووما ن
"تاریک وروون ل، ١٤٨ "

فشق وهۆر: (فشقەی بەراز)
بیستانێکم لە بنی کێوی
داچاندووە،و زۆر بە جوانی
پێ گەیوە،بەرازێک پێێ فێر
بووە وجێی برکەکانم پێخوست
دەکا.دەگەلکوو تارمایی یەکی
بەبەر چاویدادێ دەست بە
فشق وهۆرێ دەکاو دەیبەوێ
برەوێتەوە .

فش وفۆل: ( فرەوان )
رانکی من تەنگ وتێوار
مەدرووبەلکوو فش وفۆلی

بدروو .
خودا فش وفۆلّت کا !

شالّ وشاپک کەواو پاتۆلّ
جل تەنگ ونێفەک فش وفۆلّ
"بۆکوردستان "

**فەرق وجودایی** (*جیاوازی*)
ئەو دوو برایانە پوولّ و مالّیان بەش نەکراوە وفەرق و جودایی یان نیە .

بێ روحمی بەد نیهادی لە
گەلّ کوردی تا بەکەی؟
بەس بێ ئەوەندە فەرق و
جودایی ،چ ناویە ؟
"دیوانی سەیفەل، ٧٤"

**فێلّ وتەلّەکە** : ( گزە )
خودا راستە وراستی لاخۆشە کەوابوو ،فێلّ وتەلّەکە بەکار نایە .

تا کەنگێ پیاو دەتوانێ
فێل وتەلّەکەی لەکاردا هەبێ؟
رۆژێک دێ لە نێو کۆمەلّدا
درۆ وفێل وتەلّەکە لە پیاوی
سوور دەبێتەوە .

**فێلّ وفەرەج**: (دەلەسە )
تا پیاوەتی وراستی لەوێ
راوەستابێ پیاو نابێ خۆ
بداتە فێلّ وفەرەجان .

چۆن فێلّ وفەرەج نەبە
پیشەمان بوو
بێ نانی بەشی هەمیشەمان
بوو
"مەم وزین،ك، ١٥"

**فیزوهەوا** : ( خۆ ڕانان)
ئەوکابرایە زۆر بە فیزو هەوایە وخۆی پێ زۆرە و بە دەعیە یە .ئەوەندەبە فیز و هەوایە کە منەت بە سەر عەرزیشدا دەکا وخۆی بە نۆ مانگای زاو ناگۆڕێتەوە !

# پیتی (ق)

**قاپ وقاچاغ:** (ئامرازی چێشت)
وەختێک پیاو ژنی.هێنا ومالی پێکەوەنا پێداویستی ە زۆر شتەهەیە .وەکوو: راخەرو وپێخەف ،دیزەوگۆزەوقاپ و قاچاغ .کابانی مالی وەختێک نتێکی لێنا ،لە قاپ و قاچاغانی دەکا وبۆخواردن لە بێش خاووخێزانی دادەنێ .
ـ لەو گێلمە گێلمەدا قاپ وقاچاغم لە مالێ برا !

**قاپ وکەوچک :** (ئامرازی چێشت)
مالێ بابم نیسکێنە
قاپ وکەوچک ئاوێنە
"فۆلکلۆر"

**قات وناز:** ( دەگمەن)
ئەو ژنە زۆر بە قات و ناز قسان دەکا وبە قروفرە.
بیواز بێ وبەقات وناز بێ .
"گفتی پێشینیان "

**قاتی وقرِی:** (قران)
لە رابردوودا کۆمەلانی دنیا تێکەلاوی یەکی زۆریان پێکەوە نەبوو وئاگایان لە یەکتری نەبوو ،جا ئەو شتانەی کە لە سەرەوە ، باسمان کرد ،بوونەتە هۆی قاتی وقرِی ودەراویان روون ، نەبووە لە یارمەتی کردنی یەکتری .وەختێک خواردەمەنی یان وەدەست نەکەوتووە ،قاتی وقرِی هاتۆتە پێش وقرِانیان تێکەوتووە !
لە لایەک قاتی وقرِە
لەلایەک کوشت وبرِە
"تاریک وروون،ل، ٩٧ "

**قاچ وقووچ:** (راوو رووت)
ئەوکابرایە دزیوراوو رووتێ دەکا وبێتوو ئەوقاچ وقووچەی نەبێ ،نازی ، بریا دەستی لەوقاچ وقوو چەی هەلگرتبا و بەرێیەکی چاکدا رۆیشتبا !

**قاچ وقول:** (پێ )
وەختێک پیاو لەتەنکاوێکی دەدا ،قاچ وقولی هەلدەکاو رانک ودەرپێی هەلدەکێشی .
ئەوکابرایە ئەوەندەی قورِ بۆ تەندووری شێلاوە کەقاچ و قولی قەلشیوەوشەقارشە قار بووە .
کۆلە نێوی دێدئامینە
باری نالەکەری شینە

نیوەشەوێ پێی را هینـــــە
هات گەیشتە خانووی گولـــی
تەماشای کەقاچ وقولـــــی
"بەیتی ئا مینەگول "
"مصطفی سریلە "

**قا ڕووقۆڕ** : (جورەدەنگیکە )
وەختێک ڕێوی دەرفــــــەت
وەدەست دەخا و رەپێی مریشک
وکەلەبا بان دەنێ وتا مەزرۆی
ئەوەیە بیانگرێ هەڵات وبڕو و
قارِ وقۆڕیان تێدەخا وبەئێـرە
وئەوێ یاندا دەرەتێنێ .
مریشک وکەلەبا بیش لەقـــاڕو
قۆڕێ پتر چیدیکە یان لـــــە
دەست نایە .

**قا یش وقرووش** : (کەرەسەی زین)
زینی ئەسپ قایش وقرووشێکی
زۆری دەوێ .
.... خرینگ وهۆڕی قا یش و
قرووشەکەشی وەکپێشەنـــــگ
هاڕەی ئەهات ....
"کوێرەوەری "٣"

**قڕوفڕ** : ( خۆ هەڵکێشان)
هێندێک ژن وکچ زۆر بەناز
ونیمنازن وقڕوفڕیان زۆرە کار
وکردەوە وقسەیان بە قڕوفڕە !

**قڕوقەپ** : ( کپ )
کەسێک کە وستەی لێ نەیە
ودەم پێکدادا و دەنگی لەبەر
نەیەتە دەر ،دەڵێن : قڕوقەپە !

هەزارجار ربڵێین کوا مەڕنەمووکە
بێدەنگەقڕوقەپ ،لێت نــە یـــە
جووکە .
"بوکوردستـــــــــان،ل ٥٨"

**قڕەوبڕە** : ( ناکۆکی)
پێشوو خاووخێزانی ماڵەکە
- مان لەسەر دڵی یــــــــەک
نەبووین وهەموو رۆژێ کێشە و
هەراوشەڕە دندووکە بـــــوو!
بەڵام تێگەیشتین کە نابـــێ
پێک هەڵپڕژێن.بەخۆشـــییەوە
ئێستێ بێ مشت ومڕ و بێقــڕەو
بڕەین.

**قفل وهاچەر** :
زرداڵیکم هەڵواکەی لە سەد
قفڵ وهاچەر-بنێ،دەچمە زگی و
بەشی خۆم دەخۆم.

**قلی وبلی**: (خۆشی مندالانە ،)
لە مێژبوو بابی منداڵەکان
رۆیشتبووە دەرێ ونەگەڕابووە.
لە ناکاو خۆی بە ژوورێداکرد-
منداڵەکانی بەدینی بابیان
دەستیان کرد بە قلی وبلـــی و
قریوەیان تێکەوت و شـــــاد
بوون.

**قلف وقەرازە** : (ئامرازی داخستن،)
هێندێک شت بە جـــــــەررو
مەنگەنە و قفڵ وقەرازەن.
لەنێوکورد نەبێ دەسرازە نییە
ئەو بەندوقلف وقەرازە چییە ؟

"بۆکوردستـــــان،ل٣١١"

**قوڕوچڵپاو :** ( زەڵەق)

وەختێک باران دەبـــارێ، لەو کووچە وکۆڵانەیدا قـــوڕو چڵپاو ڕادەوەستێ و پەنگـــاو دەخواتەوە و کەڵــــی لـــێ دەرناچێ !

**قوڕوزەل :** ( چڵپاو )

قوڕوزەل،قوڕوزەلەق،قوروچڵپاو. پاش باران ولەنگێزەی زۆرکوچە وکۆڵانی گوندەکان دەبنە قوڕ و زەل .

**قۆرت وگرێ:** ( کۆسپ )

پیرەدایکێک لە خودای بۆ کوڕەکەی دەپاڕێتەوە کە هیچ قۆرت وگرێیەکی لە ژیانـــدا نەیەتە پێشێ.

وێکڕا دەر ئەچوو بە ڕێکەو پێکی بێقۆرتوگرێ بەلووس و لێکـی "مەموزیـــــن،ل٤٤"

**قەدروحورمەت :** ( ڕێز )

لە ماڵی زاوایڕا چووبوونە ماڵی بووکێ کە بیگوێزنـــەوە قەدروحوڕمەتێکی زۆریـــان بۆ دانابوون و ڕێزیان لـــێ گرتبوون.پاشان ئەوانیش بـە قەدروحوڕمەتێک بووکیـــان- لەگەڵ خۆیان هێنابووە ماڵی زاوا .

**قەدروقیمەت :** ( بایەخ )

وەختێک میوان دێتـــــە ماڵمان،دەبێ ڕووی لێ گـــرژ نەکەین، بەڵکوو قەدروقیمەتی بۆ دانێین و ڕێزی لێبگرین . میوان خۆشەویستی خودایە .

**قەدوبالا:** ( بەژن )

قەدوبالایان وێنەی نەمامـــان کێ دێ نەمامان بگرن شەمامان ؟

"دیوانی سەیفە ل ٥٢"

چ خۆشە وەجهی سەرو وگوڵ بـــە دینی قومری وبولبول

دەمێک شەیدای قەدوبـــــالا ، دەمێک شێتی دەهانت بم .

"دیوانی وەفائی،سەیدیـــان، ل ٧٤"

**قەدوگیپاڵ:** (دیمەنی بەژن )

ئەو کابرایە قەدوگیپاڵێکی نالەباری هەیە ،زۆر شـــل و شەوێق وپانتول لێ کەوتــووە . بە قەدوگیپاڵی هەڵمەفریـــوێ دوور کوژی نێزیک خەسارە !

**قەراروبریم** (قەرارومەدار )

قەراروبڕیەمان ئەوەیـــە ؛ ئەمن زمانی کوردی بـــــەو کابرایەی فێرکەم و ئەویـــش زمانی عەرەبیم فێرکا و هـەر دووکمان ئەو قەرار وبڕیـەی ڕەعەمەل بهێنین و بەڵێنـــی خۆمان بەرینە سەر.

**قەرارومەدار :**(شەرت وشوێن )

قەرارومەدارمان داناوە و شەرت وشوێنمان بڕیوەتەوە کە ئەو کابرایە بێستانەکەمان بۆ ماوەی پێنج ساڵان ڕەنێو بهێنێ و هیچ بروبیانووم لێ نەبینێتەوە ،بێتوو بەنیوە و نیوەچڵی دەستی لێ هەڵگرێ، هیچ پووڵ و پارەیەکی لەمن نەوێ!

**قەراغ وبێجاغ:** ( لێوار )

بە قەراغ وبیجاغی چۆم؟ بەستێن دەگوترێ.قەراغ و بیجاغی هەمبانەکەی بپشکنە و دەستی تێ بگێڕە تاکوو دوو گوێزان، ببینییەوە !.

ـ ناوێرم ڕێ وراست قسە بدرکێنم

ـ قەیدی نیە هێندێک قەراغ و بێجاغ تێک کەوە دوایە بیلێ .

کاکی شوان بۆ لە قەراغ و بێجاغی بێستانەکەم نابییەوە، تووشی زیانی دەبێ !

**قەرزوقۆڵە :** (دەست قەرز)

قەرزوقۆڵەیەکی زۆرم لەسەر خەڵکی هەیە ،بێتوو ئەو قەرز وقۆڵانەم وەدەست خەمەوە ، دەوڵەمەند دەبم و دەئەنگرێم وشای بە سەپانی خۆم ناگرم.

**قەزاوقەدەر:**

قەزاوقەدەر ڕەد نابێتەوە دەبوو ئەو کارە هەر ببێ.

" گفتی پێشینیان"

زۆری وەکوو مەی قەزاوقەدەر چاندودروون

بێهوودە چ داگرم خەمی بوون و نەبوون؟

"خەییامی هەژار ،ل٢٧

**قەڵڵەودەڵڵە:**

هاتم سەودای لەگەڵ بکەم ،لیی کردمەقەڵڵە ودەڵڵە

لێم مەکە قەڵڵە و دەڵڵە مەمپەڕێنە سەر زەڵڵە شیونی وەک قەندی کەڵڵە

"گۆرانی"

**قەل وداڵ:** ( باڵندە )

ئەم درک وداڵەوئەمقەل وداڵە ماونەوە لەشوێن ئەوگەورەماڵە

"دیوانی پیرەمێردل١٢٥"

دەترسم بمرم بە چلووی زستانێ قەل وداڵ بمخۆن یا ڕێپێنەزانێ

" گۆرانی"

**قەلەوقووتە :** (بانگ نەهێشترا و خەڵکێکی زۆرم بانگ نەهێشتبوو ،بەڵام چەندکەسێک لەو بانگ هێشتراوانە قەلە و قووتەیەکی زۆریان لەگەڵ خۆ هێنا بوو !

**قەڵت وبڕ :** (چاک نەهاڕین)

ئەوڕۆ ئاشەکە کەمەرەدەکا.

وگەنمەکەی جوانی لێ ناکا و
نایهاڕێ،هەر قەڵت و بڕی
دەکا !

لەبەر ئەوەی خلێنەکانم
کێشاوین،نانم بۆ ناجووترێ.
نانی کە دەخۆم هەر قەڵت و
بڕی دەکەم و ڕۆی دەهێڵم!
دارەکەم قەڵت و بڕ کرد و
بەجێم هێشت .

**قیزوبیز :** ( دڕدۆنگ )
ئی واهەیە زۆر بە قیز و
بیزە.شتێک تا بە حەوت
ئاوانی نەشواتەوە ،نایخوا.بەو
جۆرەش دڵی هەر پاک نابێتەوە
ئەو کەسە لە ژێری خەڵتەی
دەگرێ! ئیواش هەیە بە
پێچەوانە بەقیز وبیزنییە
و هەرچی لەپێشی دانێن
دەیقۆزێتەوە و بێ ئەوەی
چاوی لێ بکا ،ڕۆی دەهێڵێ و
دەربەستی پاک وخاوێنی شتی
نییە ! بەڵام نەواش ونەواش.

**قیت وقنج:** ( قۆز )
سەرەڕای ئەوە کە پیرە
ئێستاش هەر قیت وقنجە .

ئەو کابرایە وەختێک
دادەنیشێ،خۆی تێک ناسرمێنێ
وسەر دەقەلان ناخا ،بەڵکوو بە
پێچەوانە قیت وقنجە .

ئەو کابرایە نەخۆش
کەوتبوو ،ئێستێش خۆی
نەگرتۆتەوە و قیت و قنج بە
ڕێیەدا ناڕوا و هەر لاکەی
سەری دێ !

**قیت وقۆز :** (قنج ولەبار )
کچێکی قیت وقۆز و کەڵەگەت
شاکاری دەست ونەخشی،تەبیعەت
"تاریک وروون،ل ١٩٩"

**قیروسیا :** (پەژیوانی)
چەندجارم پێ‌گوتە ئەو
شتانە مەکرە ،زیان دەبینی!
هاتوو زیانیشت دی بەئەستۆی
خۆتە ! ئێستێ کە زیانی دیوە
قیروسیا !

**قیژوهۆڕ :** (قیژەی لەپەستا )
هێندە بێدڵی ئەو منداڵە
ساوایەی مەکە ،باقیژوهۆڕمان
بۆ ساز نەکا !هێندێک کەس
لەباتی ئەوەی هێدی وهێمن
قسان بکەن،دەیکەنە قیژو
هۆڕێک مێشکی سەری پیاوی
دەبەن!

**قیژەوهەرا** ( هەراوهەنگامە )
وەختێک لێیان چوومە
ژووری، قیژەوهەراولێدان و
کوتانێک بوو ،باب ئاگای لە
کوڕی نەبوو وسەگ ساحێبی
خۆی نەدەناسییەوە !

ئێستێ کە قسەی تۆ
دەسەلمێنم ،ئیدی قیژەوهەرای

پێ ناوێ .

**قیل وزەفت:**

پیمانەوە نووسابووی، هەر
وەکوو قیل وزەفتی
نەکەی بگەڕێیەوە ،حالا کە
رفتی ......رفتی
"تاریکو روون، ل ۱۲۸"

**قیلەوقاچ:** ( لار )

سواری چاک بە قیلەوقاچ
دەنگێوێ.

گوریسەکەی جارێکی دی لە
بارەکەی وەرسووڕێنەوبە قیلە
وقاچگرێیەکی لێدە.

# پیتی ( ک )

**کاروبار:** (کردنی کار)

بەرهەم بوو بەهۆی کر و
نیکارت
سەر سوورە جیهان لە کارو
بیارت
دەرناچێ سەرم لەکار و
بارت
کێلی وابووە بووبی
ئاگەدارت ؟
بەختی مەلەخەو هەلستی
جارێک
جارێک بکەوێتە کار و
بارێک
بە گوێرەیی رێ وشوێنی
جاران
رێک کەوتنە کاروباری
یاران
"مەم وزین،ل،۵۰،۷،۱۲۰،۴۸ "

**کاروپیشە:** (سەرقال بوون)

وەک کۆتری سەربالم شینە
کاروپیشەم هەرگرینە
ئەسمەران خوێنیان شیرینە
"گۆرانی"

**کاروکاسبی:** ( سەودا )
بێتوو کەسێک لە ماڵی
نەیەتە دەرێ وکاروکاسبی یەکی نەکا ،ناتوانێ بژی .
...... ئەوسا بێمە لاتان
بەشکوورزگاریان بێت ،
بچنەوە سەرکار و کاسبی
خۆیان ....
"کوێرەوەری،ل، ٤٣ "

**کاروکردەوە :** ( ئاکار )
بەکاروکردەوە پیاو خۆی بە خەڵکی دەناسێنێ . هەر کەسێک بەکاروکردەوەی خۆی، نیشان دەدا کە چ جۆر کەسێکە

**کاڕوکووڕ :** (باڵەی مەڕ)
چ خۆشە کاڕوکووڕی مەڕ، چ
خۆشە پڕمەکەی کەحلان
چ خۆشە فیتەفیتی شوان، چ
خۆشە ئۆحەیی گاوان
کاڕو کووڕی بزن ومەڕ
لرفە لرفی لۆک و نەڕ
"تاریک وڕوون،ل١٠٦،٦١"

**کاکەسەن ومامەسەن :**
کاکەسەن ومامەسەن هەر یەک جوورن .وەک دەڵێن :
چ بەرلە سەرێ،چ سەرلەبەرێ .

**کاکەوبرالە :** (خۆ رێک خستن)
بەکاکە وبرالەگوتن خۆی لەگەڵ رێک خستم، بە دەست بڕودز دەرچوو .نەقڵی کابرام لێ وەدی هات:پشی پشی نانت دەدەم ،ئاوت دەدەم ، شەق لێت دەدەم !

**کاڵ وکرچ :** ( نەگەیو )
ئەو سێوانەی بۆت داناوم ،
نەگەیشتوون وکاڵ وکرچن و
ناخورێن .
تۆوەکوو مەجرووم قەت لە
من نەکەی
بەقسەی کاڵ وکرچ تۆ
جوابم نەکەی
"بەیتی بارام وگوڵەندام ،
قادر فەتتاحی قازی،ل٣٤"

**کاڵ ونەکوڵیو :** (پوختەنەبوون)
گۆشتی کاڵ ونەکوڵیو بۆ خواردن نابێ وناخۆشە .
مرۆڤ لە رابردوودا بەر لەوە رابێ وعالابێ هەمووشتێکی بە کاڵ ونەکوڵیوی پڕی پێدا دەگرت ولە زاری داخنی و رۆی دەهێشت .دوێنی شەوێ لە پەلە پەلی یان گۆشتەکەمان بە کاڵ ونەکوڵیوی خوارد .

**کاڵەوپێتاو :** (پێڵاوچەرمین)
ئەو کابرایە ئەوەندە ئاکاری باشە کە بە کاڵە وپێتاو دەچێتە بەهەشتێ .
ئێستیش لە هێندیک جێ پێڵاو هەر کاڵە و پێتاوە . کە

لە زوێلە چەرمی خاوی رەشـەولاخی دروست دەکرێ ولە پـێ دەکردرێ .

**کانی وئاو:**
کانی وئاوی ئەو دێ یەی لەبەر مالانە وئاش گێرێکە .

**کاوکادێن:** ( داهات )
ئەو کابرا یە خاوەن کـا و کادێنە ،هەمیشە تفاقی زیادی دادەخا ولە تەنگانـە دەترسێ .
کینا یە بۆیـپاوی بە مشوور :.

**کاوکۆت** :وردە کا )
لـە جۆخین،وەختێک شـەن دەکەن،کاوکۆتێکی زۆر بـلاو دەبێتەوە .بەدوای قـورە کاریدا ،کاوکۆتێکی زۆر بـە ولاتی وەر دەبێ .

**کرچ وکالّ** :(بێ ئـەزموون)
ئەو کیژۆلە هێشتا کرچ و کالّە وبۆ شوو نابێ .

**کردوکۆ** : ( ئاکار )
رەگی چاوگی "کـردن " و "کووەبوون" دەبێتە: کردوکۆ. ئاکامی هەلسووڕانی زۆر وبێ وچان وبە دلّ ودا و بۆکردنـی کارێکی دەبێتە کردوکۆ .
ئەگەر کردوکۆو پشکنینەوەی ، تۆ بۆ وەدەست خستنی بەلگە و سەرچاوە نەبا ،ئەو کتێبـە ئاوا بەربلاو ویاراو دەرنە - دەچوو .

**کردەوەوئاکار** :(خوو ورەوشت
هاوتای کردەوە و ئاکـار خوو ورەوشتە . بێتـوو کردەوە وئاکارمان چاک نەبێ کەس ددانی بە خێرمان پێـدا ناهێنێ .

**کردیان وکراندیان** :(حەول دان

هەر چی کردیان وکراندیان وحەولیان دا نەیانتوانـی لەشکرەکە تێک بشکێنـن و ناچار بوون بگەرێنەوە .

**کرێوەوباکوت** ( گـردە لوول )
کرێوەوباکوت بەفرێکە کـە بە بای ببارێ .لە کرێـوەو باکوتدا چاوچاوی نابینـێ رێبوار رێ ون دەکا وبەفرەکە لە زۆرجێگا یاندا دەپەستێودرێ ورنوو پێک دێنێ .
بە سۆزەی زریان پیـاوی دەکەی سر
بەکرێوە وباکوت ئـاژەلّ دەکەی قر
"تاریک وروون،ل، ٧٥ "

**کرێوەوبۆران**( باو بارن )
جاری واهەیە لە زستانـدا کرێوە وبۆرانێک دەستپێدەکا

کە چاوچاوی نابینێ . هەر هەنگاوێکی کە پیاو هەڵی دێنێتەوە زوو کڕێوە وبۆران پڕی دەکاتەوە لەبەفر، خۆ بێتوو پیاو لەو کڕێوە و بۆرانە لە رێدا بمێنێتەوە ، سەری لێ دەشێوێ ودەرچوونی بۆنیە !

**کزوڕەقەڵە** : ( لاواز )
پێچەوانەی کزورەقەڵە قەڵەووگۆشتنە . هێندێک کەس ئەوەندە کزو رەقەڵەن، کەپۆیان بگری گیانیان دەردەچێ .

**کزوزەبوون**: ( رەقەڵە )
لە دوای نەخۆشی ئاستەم، نەخۆش چاکیش بووبێتەوە و هەڵیش هەستابێتەوە هێشتا هەر کزو زەبوونە و وەک مندالێ دارەدارەی دەکا و هەر لاکەی سەری دێ .

**کزومات** :( داماو )
هەر کە ئەو خەبەرە ناخۆشەم پێ گەیی کز ومات دانیشتم .

**کزەوسۆزە** : ( سۆزی سەرما )
کزەوسۆزەی زریانی پاییزان لە ولاتی ئێمەدا برست برە .

**کشتوکاڵ**: (کاری داچاندن)
وەرزێر بە کشتوکاڵ دەغڵ ودانمان بۆ رەنێو دێنێ وپشوو داتی نیە .

کشتوکاڵ وجووتوگامان
دێتەسەرباری لەبار
پەردەبێ تێروجەواڵ و مشت
دەبێ عەمباری کورد
"تاریک وروون،ل،١٢٥"

**کش ومات** :
خوێندەواری کش و مات
سەرنجی دیوار ئەدات
"ملوانکەی شین ل،٢٦ "
بێگانە بەدەر بەرۆشنایی
کش بوو،کش وماتی تاریکایی
"مەم وزین ل،٤٨ "

**کفت واکۆ** :
ئەو برینە زۆربە کفت و کۆیە و هەرچلاٌن دەدا و زۆر دێشی. دوێنێ ئەو مەلحەمەم لەسەر دانا کفت وکۆی لێ بڕی، وابزانم بەرەو سارێژبوونە .
لەپاش ئەو رەنج ودەرد و کفت وکۆیە ، دەبینن کوتەڵی حاجی لە کۆیە .
"تاریک وروون ل، ٢١٤ "

**کفت وماندوو** :
پاش کارکردنی زۆر پیاو هێزی نامێنێ وکفت وماندوو دەبێ .

**کفن ودفن** :
مردوو کفن و

دفنی دەکەن وتەلقینی دادەدەن ولە مالێ یا لە مزگەوت بۆی دادەنیشن وسەرەخۆشی کەری پێوە دێن وقورعان خوێنان قورعان دەخوێنن.

**کلک وپوور :**

هێندێک ژن خزم وکەسیان زۆرن وەختێک دەچنە مالی مێردی ئەو خزم وکەسانە هەریەک بەجۆرێ خۆبە سەر مێردەکەیدا دەسەپێنن . بەم خزم وکەسانە کلک و پوور دەگوترێ .

**کوان وکوتر :**

دەم وچاوی ئەو کوڕەی زیپکەی لێ هاتووە و کوان و کوتر دای گرتووە . بە برین و زیپکەوقونێر دەلێن :کوان و کوتر .

**کوت وپڕ :**

واتە دەم ولە حاست ، هێندەی بلێین یەکودوو،هێندەی مستلە چاوان دەی ،هێندەی فوولە قەننەی کەی ،لەپڕێک ، دەم ودەست ،نەخۆشی یەکی گرت وکوت وپڕ پێی مردا!

لە دوایی ئەو خۆشەویستە
کوت وپڕ
کەهەلیان پچڕکان وکەوتە
سەرئاگر
"پیرەمیرد ،ل،۲۳۶ "

**کوت وتاس :**

جاری واهەیەمندال لەزەبر دەگری وهەنیسکی وادەدا کە کەم دەمێنێ سەری پێوەبچێ! بێتو ژیر نەکرێتەوە ونەغا ـ فلێندرێ لەکوت وتاس‌وەدەچێ دوای ئەوەش گەشکە دەیگرێ .

**کوت وکولکە :**

وەختی هەلاج خوری هەلاجی دەکات، کوت وکولکەی زۆری لێ دەبێتەوە .

**کوچک وبەرد :**

ئەو زەویە پڕلە کوچک و بەردە .

**کوچک وکەلەک :**

لە عاسمانی تەبەق تەبەق
لە عەرزییە کوچک وکەلەک
ماندوو نەبی عەبا بەلەک
"فۆلکلۆر "

**کورت وکرمانجی :**

هێندە لەسەری مەڕۆ و پەرەی بە قسەکەی مەدە کورت وکرمانجی بیبڕەوە .

دەردی دل دەکەم کورت و
کرمانجی
حەسەن کرمانجە ، چی لە
دیلمانجی
"دیوانی سەیف ل، ٥٤"

**کورکەونووکە نووک :**

کورکه ونووکه نووک وبۆلە
ـۆلێکی توندەکه خەلکی دیش
گوێیا ن لێ دەبێ ،زۆرتر ژنی
به برۆبیانوو به لوتـــک و
پۆتک ،بەکورکەِ ونووکه نووکه،
پیاوی ترسەنۆک وەک پوشکه
سووکه
ژنی بیوەبه کورکەونووکـه
نووکه
"دیوانی مەلامحمدکویی ل ۱۱"

**کورِوکاژ :**
کورِوکاژ هەلدەپـــــەرِن و
چاوەرێی چاوەش نین شاییـان
بۆبگێرِێ ،بۆخۆیان به نۆره و
بەگەرِ شایی دەگێرِن .

**کورِوکال :**
کورِوکال شایی وزەماوەند-
یان دەگێرِا ودەبوو بـــــه
گۆوەند و هەلاّ .
. بۆجێژنی رِزگاری وسەری سال
کیژۆلەی کوردو کورِو کـال
"بۆکوردستان ،هەزار ل۵۱،"
دلاّنِ دەبەن به تـالاّن
کاس دەکەن کورِوکالاّن
"تاریک ورِوون ل ۱۰۹، "

**کوشت وبرِ :**
رەگی چاوگی کوشتن وبرِین)
کــــوشـــت وبــــــــرِه،
له لایەک قـاتو قــــــرِه
له لایـەک کوشت وبــمـــرِه
"تاریک ورِوون ل۹۷، "

**کولّ وکۆ :**
خەمێکی زۆری لەدلّدا بـــوو
وەختێک قسەکەم پێ گوت کولّ و
کۆی دلّی دامرکا .
چێژی ئازادی دەچێــژن
کولّ وکۆبەخەم دەرِێژن
"بۆکوردستان، ل ۵۴، "

**کون وکاژێرِ :**
ئەو خانوه کۆنەیەو کون و
کاژێرِی زۆره ، ئـەو کــــون و
کاژێرِانه مشکیان زۆرن .

**کوێروکوتر (کوترِوکوێر) :**
خۆمان هەموو کوێر و کوترو
بـرسی
زین کورت وئەویش له گــه ل
مەترسی
"مەم وزین ،ل۵۶"

**کوێروکەرِ :**
کومرِان له جوانی بـــــەش
برِاون
دلّیان کەرِوکوێرودەمدرِاون
"مەم وزین ل۵۶ "

**کۆت وبەند :**
له رابردوودا بۆ بەرگری لـه
هەلاّتن دیل ویەخسیرەکانیان
کۆت وبەند دەکرد. کۆت دارێکی
ئەستووری کون بوو له ملی
زیندانی دەکرا .

**کۆت وزنجیر :**
کاتێ کەدەهاته بەردەمی میر

وەک بەندیەکی بە کـــۆت و
زنجیر
"مەم وزین ،ل، ٥٩"
دێ زرەی کۆت وزنجیـــــر
هەرلێیمان دەسوون شمشیـر
"تاریک وروون ل، ٩٩ "

**کۆچ وبار :**
کاتێک خێلات بەرەوکوێستـان
دەچێ ،کۆچ وبارکردن دەســت
پێ دەکاتەوەرێ دەکەون .

**کۆچ وکۆچبار :**
ئەوانەی کە بە دابـــــی
خێلاتی وکۆچەری دەژین لـــــە
جێیەکی دیاری کراو نیشتەجـێ
نین ،بەلکوو هەر خەرێکی کۆچو
کۆچبارن .

**کۆشک وتەلار :**
خانووەکەی چۆنە؟ خانـووی
چی ،بلێ کۆشک وتەلار .
گەرچی رەنجی شانی مەکۆشک
وتەلار پێک دێنێ
هێزی ئەم دەستانەشە بــــە
جارێ ئەیرمێنێ

**کۆک وپۆشتە :**
پێچەوانەی کۆک وپۆشتـــــە
شرۆل وڕووت وڕەجالە ،زۆرکـەس
هەن دەستیان دەڕوا بەلامخۆیان
ڕووت وڕەجال دەنوێنن نــــە ک
کۆک وپۆشتە .
کۆک وپۆشتە بم ، ڕووت و
ڕەجال بم؟
کۆشکم دەقات بێ ،وێرانـــە
مال بـــم .
"بۆکوردستان ،ل، ١٨ "

**کۆلەکە وکاریتە :**
کۆلەکەوکاریتە "نیرگە"ن کە
دەبنە هۆی ئەوەی خانوێـــــک
تێک نەتەپێ ،لە نێوان کۆلەکە
وکاریتەدا ،کۆلەکە گرینگ تـرە
چونکوودەدرێتە ژێرکاریتـە ، و
زەبری زۆری لەسەرە .

**کۆنە ونوێ :**
شتێک نەزۆر کۆن بێ ،نەزۆر
نوێ ،جل وبەرگەکانم هەر کۆنە
ونوێ بن دەیانبەخشم .

**کووچە وکۆلان :**
چلەی زستانێ ناخۆش بـــــوو
تەزووی سەرمایە پیاوی سڕدەکرد
وکووچە وکۆلان لە بەفرولێتـــە
پڕببوون .
"تاریک وروون ل، ٨٦ "

**کەپۆولـووت :**
گوتیان :نۆرە ئــــاوت دوو
سبەی دەگاتێ ،کەپۆولووتـــــی
هەلقرچاند ورۆیی .

**کەچ وکرووچ :**
هاوتای کەچ وکرووچ خوارو،
خێچە .
بێ ناوی تونا مە هیـــچ و
پووچە

نەتنووسێ،بنووس کەچ و
کرووچە
"مەم وزین،ل،٣٠"

**کەرکۆڵ وبارسووک :**
ئەو هەموو شتەی کەلەسەر
بەکتدا ناوە پێمان ناگوێزر-
ێتەوە،بێتوو بە قسەی مـ-
ـکەیەهەربار ی کەرێکی رادەگو-
ێزین،کەرکۆڵ وبار سووک. -

**کەروبار :**
یاخوا بەخێربێ هەموو جارێ
بە کەروبار ،دیاریم بۆدێنێ .

**کەروتێر :**
کەرێک بە تێرەوە بەورێگا
سەردەلآنەیدا تێ هەڵبـــوو،
سەرسمێکی داو تێرەکەی لەسەر
پشتخزی !
یان دەڵێ :لاوە باسی کەر و
تێرەکە بکەن !

**کەروخۆڵەمێش :**
ئەو دوومنداڵە خزمایەتیان
هەیە بەڵام ئەو خزمایەتیـــە
زۆر دوورە ، کەوابوو کــەر و
خۆڵەمێشن .
پێوەندی کەروخۆڵەمێـــش
ئەوەیە ،کەرخۆی لەخۆڵەمێشـدا
دەگەوزێنێ .

**کەروگا :**
تا نەزانین لەبرەودایـــە
ئەمن بێ برەوم.

ڕۆژ هەتا رۆژی کەروگایـــە ،
لە تاریکە شەوم
" شەرەفنامە،ل ، ٦٥٥ "

**کەرەوزو بیبار :**
بە گیاوگۆڵی نێوترشیاتـــی
دەڵێن کەرەوزو بیبار .

**کەرِوکوند :**
ئەگەر قسەی بەکەیفی نەبێ
خۆی کەرِوکوند دەکاوچ شتێکی
گوێ لێ نیە .

**کەرِولاڵ :**
نەداغی جەرگی خۆمزانی،نـە
مایەی جەرگی خوێنینم
شەهیدی دەستی عیشقم ،لالـە
رەنگم من کەرِولاڵم
"دیوانی وەفایی ل٥٤"

**کەژو کێو :**
هەڵفرِی راوکەری زاڵی کەژو
کێو
لە چیای بەرزەوەرِووی کردە
نشێو
" سوارە،هەڵۆ "

**کەسک وسوور :**
دیوارە رەزی تەکووز رێز
رێز
گیرابوو لەکەسک وســوور
پەراوێز
"مەم وزین،ل، ٦٦ "

**کەس وکار :** (خزم)
شوانێکی هەزاری بێ کەس

وکار
چەند تاجی پەڕاند بە
تیخی مووکار
"مەم وزین ل،۹۰و ۸۵"
گوتیان بەکوڕان بەرەی
کەس وکار
یان بمرن ویا نە مەم بێ
رزگار

**کەشم ونەشم :**
وەکوو کەشم ونەشمی بووکێ
وەک رەنگ وبۆنی گڵۆکێ
"تاریک وروون ،ل،۱۵۸"
ناهێڵم بزی چۆنت دەبەخشم
کەڵی چەقەسوی بێ کەشم و
نەشم
"بەیتی کەڵ وشێر ،ل، ۲۱۴"

**کەفتە ورەفتە :**
بابم! مالآت پێی رانەگەی
کەفتە ورەفتەی زۆر دەبێ .
ئەوەندە لە دەست و بووی
خۆم نەکەوم کە کەفتە ورەفتە
بم وخزم وکەس پێمەوە ،
سەغڵەت بن .

**کەف وکۆڵ :**
لە زۆرشتدا کەلێ دەنڕێ
دەبێ کەف وکۆڵ بگیرێ و
برێژرێ .

**کەلک وکار :**
ئەو جل وبەرگە ئەوەندە
لەبەرکراوە و بەرو پشتیان
کردووە کە پواوە وکەلک و
کاری نەماوە .
ئەو پیاوە پیرە لە دەست
وبوو کەوتووە و کەلک وکاری
نەماوە .

**کەل وپەل :**
نوێ مالم و وردە وردە ،
خەریکی کەل وپەل پێکەوەنانم

**کەلێن وقوژبن :**
ئەو مالە کەلێن وقوژبنی
زۆرە و پیاو بە دڵنیایی
دەتوانێ خۆی لە چاوی دوژمن
حاشار بدات .

**کەلێن وکولێن :**
کەلێن وکولێن وەک کەلێن
وقوژبن،شتێکم لێ ون ببوو
سەرپاکی کەلێن وکولێنی
مالێم چاوپێدا. خشاند ،نەمد-
یتەوە .

**کەلەک وکولەک :**
هاوتای کەلەک وکولەک ،فڕ
وفێڵە ،ئەوکابرایە کەلەک و
کولەکی وادەگێڕێ دەستی
شەیتانی لە پشتەوە بەستووە .

**کەم وزۆر :**
خەلک ،کەم وزۆری بۆ
سەیران لەشاری چوونە دەرێ و
کەس لە شاریدا نەما .

**کەم وکووڕی :**
ئەم کتێبەم نووسیوە ئەگەر

چی کەم وکووڕیشی تێدایە .

**کەند وکلۆ :**

ئەگەر دنیا مژو تەم و
تاریکە
ئەگەر ڕێگا کەندوکلۆو
باریکە
ڕاچەنی لەم وتەیەپیرە
هەڵۆ
هاتە بەرچاوی گەلی
کەندوکلۆ

"بوکوردستان،ل١٠٥، ٢٦٦

**کەندوکۆسپ :**

ڕێگەی ژین بێ کەندوکۆسپ
نیە .
کەندوکۆسپ هەنگاوم پێی
ناکاشل
بێتە سەرڕێم هەزاران،
گابەردی زل

"تاریک وڕوونل،١٧٧ "

**کەندولەند :**

واتە بەرزونزم ئەو
ڕێگایە کەندولەندی زۆرە .
دێم بەرەوزورگ وتەلان و
کەنلولەند
دێم بەرەو بزوێن و
زەنوێروزەمەند

"ناڵەی جودایی ل، ٢٣ "

**کەوڵ وپۆست :**

وەختێک گەیشتمە ئەوشارەی
کەوڵ وپۆستم بەعەرزی دادا و
نیشتەجێ بووم .
وەک دەروێشەکەی گۆلی
زرێبار
کەوڵ وپۆستی خۆم
کێشابووە کەنار

"دیوانی پیرەمێرد ،ل٢٢٧

**کەیف ونەهەنگ:**(خۆش رابواردن)

وەختێک عاشق ومعشوق
دەگەنە یەک ،خەریکی کەیف و
نەهەنگ دەبن و وانازانن
لەسەر دنیاشن .

**کەین وبەین :**

زۆرجار کوڕوکچ پێش لەوە
ببنە هاوسەر،پێکەوە کەین و
بەینیان بووە .
خزمەتت دەکەین ئێمەش
تاکوو هەین
تۆش دەرسان بلێ بەبێ
کەین وبەین

"دیوانی سەیف ،ل ،٦٨"

**کێم وزوخاو :**

هێندێک برین وەبن دەدەن
وکێم وزوخاوی زۆر خڕدەکەن و
ئاوی دەدزن وهەڵدەمسێن.
ئەگەر مەلحەم وهەتوانی
لەسەر دانێن کێم وزوخاو،
و زنجکاو لەبنەدێ وبرینەکە
سارێژ دەبێتەوە .

**کێووتەلان :**

بەهاران زۆرکەس بۆ گیای

بەهاری بەکێووتەلان‌دا هەڵدە-
گەڕێن .

ئاشقی چاوی کەژاڵ و
گەردنی پڕخاڵ نیم
ئاشقی کێووتەلان وبەندن
وبەردم ئەمن
"تاریک وڕوون ل٤٩٠ "

**کێوودەشت :**

هەوارنشینان کێوودەشت دەتەقێنن لەم هەوار بۆ ئەو هەوار دەڕۆن .

**کێووکاو :**

هاوتای کێووکاو ،شاخ و داخە ،کێووکاو لەتەپۆڵکە و بستوی بەرزترن .

# پیتی گ

**گاڵتەوگەپ :**

ساڵان رادوێ بەرنامەی
گاڵتە وگەپ وقسەی خۆشی بوو .
ئێستەکە کوردە هەموبێ
هەمم وبێ دەردوخەمە
شارە ئازادە دەکا گاڵتە
وگەپ وکەیف وگەمە
"تاریک وروون،ل، ٤٥ "

**گاڵ وگغ :**

منداڵی ساوای شیرەخۆرە ، دەنگ هەڵدەبڕێ و وڕینگە وڕینگێک دادەنێ کە پێی دەڵێن :گاڵ وگغ .

**گاوگۆل :**

گاوگۆلەکان لە گاڕانن ، بۆرگیایەکە لە پاییزدا دە-یدرونەوە ،وزستان دیدەن بە گاوگۆل .

**گاووگەردوون :**

پێم خۆشە خۆم بکەم بەگاو
وگەردوونت .
جێژنی شایان گاو
گەردوونی دەوێ

خوێنی گەش وفرمێسکی
روونی دەوێ
"تاریک وروون ل١٧٩٠"

**گران وسەنگین :**
سەرتۆپی کوران وناوی
کورگین
مەردوبەئەمەگ ،گران و
سەنگین
"مەم وزین ل، ٧٦٠"

**گردوکۆ :**
کابانێکی پوختە مالێکی
گردو کۆی هەیە .

**گرژو مۆن :**
هاوتای گرژومۆن،مرچ و
مۆنە ،پێچەوانەکەشی سەر و
رووخۆشە .
ئەو کابرایەنێوچاوی گرژ و
مۆنە .

**گرم وهۆڕ :**
ئاهەنگی ژین وشادی بۆ
بەیانی کە تێکەڵ دەبوو.
شمشاڵی من،خرمەی بازن ،
گرم وهۆڕی مەشکەی گاوس .
"تاریک وروون ل١٦٨

**گرێ وگۆڵ :**
دڵ ودەروونی ئەوکابرایە
بێ گرێ وگۆڵە وبێ غەورە .

**گڕوگف :**
پیاو لە هەرەتی هەرزە ـ
کاریدا ولە برەم برەمی
لاویدا ،بەگڕوگفە .وەختێک
دەنێوەچووگڕوگفی دادەمرکێ .

**گڕوگاڵ :**
منداڵ پێش ئەوەی زمان
بکاتەوە گڕوگاڵ دەکات .

**گزوفت :**
هێندە ئەو منداڵەی گز و
فت مەدە .
بۆخۆی تێرگۆشتەلەئازاڵی
من
گزوفت ئەداوە منالّی من
"بۆکوردستان ل، ٩٧ "

**گژوگیا :**
بۆسەیری بووک لەهەرلاوە
گیاوگژ سەری دەرێناوە
"بۆکوردستان ل٤٣٠ "
گیاندار دەچوو گیانیان
بە تالان
گیاوگژ،دا روبەرددەنالّن
"مەموزین ل، ٢٢ "

**گفت وگۆ :**
بلوێر بێ دلّم بەداخ و
سۆ بێ
وەک تووتی دەمم بە
گفتوگۆ بێ
"مەموزین ل، ١٧ " "

**گفت ولفت :**
ئەوکابرایە لەقسەکردندا
راوێژ خۆش وگفت ولفتی
شیرینە .

تۆزی مڕومۆچ رووتاڵ و
تفتن
بەڵام وەک دەڵێن بە
گفت ولفتن
" بۆ کوردستان "

**گنج وفنج :**
هاوتای گنج وفنج ،گنج و گۆڵە پزوی دەرپێ گنج وفنجە تا بە جوانی لەدەوری زگی وەربێ ودانەخزێ .

**گنج وگۆڵ :**
وەختی کراس دەشورێ گنج و گۆڵ دەبێ .

**گورج وگۆڵ :**
پێچەوانەی گورج وگۆڵ شل وشەوێقە .

هەموویان توندوتۆڵ وگورج
وگۆڵ وچوست وچالاکن
هەموویان بێ فڕوفێڵ وبە
کاروسادە وپاکن
"تاریک وروون ل،٥٩"

**گورزوگۆپاڵ :**
بە گورزوگۆپاڵەوە بۆی چوون .

**گوزو گونبەد :**
هاوتای گوزوگونبەد ،دەم و لەحاست ،کوت وپڕ ودەست بەجێ یە ،ئەگەر بێت وگوێز توورِبدرێتە گونبەزێکی، خۆی رانا گرێ ودەخلێتە خوارەوە .

**گوللەودەرمان :(گوللە و بارووت )**
بێتووگوللەودەرمان نەبێ شەڕی قورس ناکرێ .گوللە و دەرمانی بایزاغایەوشەق لە کەندەڵان .

**گول ودووزام :**
بۆچارەسەرکردنی گول و دووزامی هەولێکی زۆر دراوە . تا گول ودووزام لەو بەلایە رزگار بن .

**گۆج وئیفلیج :**
وەختێ کەسێ ،نەفەرێکی گۆج وئیفلیج دەبینێ قەدری لەش ساغی دەزانێ .

**گۆڵە وتەبەق :**
رەشە وەلاغ تووشی گۆڵە و تەبەق دەبێ ،لە گۆڵە و تەبەقدا زمان وسمی رەشەولاغ دوچاری نەخۆشی دەبێ .

**گەرما وگەرم :**
لە گەرماوگەرمی کاردا . نەخۆش کەوت .کاردەبێ گەرماو گەرم هەڵیکوتیە سەری .

**گەرم وگوڕ :**
بەبێ پێخەف شەوێ گەرم و
گوڕە لەش
کە یاری نازەنین بگری
لە باوەش
"نالەی جودایی ل، ٧٢ "

**گەرم ونەرم :**
گەرم ونەرمە لێم ورگنە
پڕلە گللێرەی هەرزنە
بە پێستەوە بۆخواردنە
"گیپە"
بۆوان دڵی ئێمە گەرم
ونەرمە
درکانی گرانە کچ بە
شەرمە
"مەم وزین ل، ٤١"

**گەدوگیپاڵ :**
کە شێخ وواعیزوسۆفی بە
جەننەت بەن گەدوگیپاڵ
دەبێ شەمساڵ ئێمە بۆ
جەهەننەم بەین سڕوسیپاڵ
"دیوانی مەحوی ل ٢٠١"

**گەزوڕبە :**
هەرکەسێ شتی بە گەزوڕبەی
خۆی دەپێوی وهەڵیدەکێشێ .
"پەندی پێشینیان"
ئەو گەزو ربەی پەسند ناکەم .

**گەزۆ ومازوو :**
هەندی کەس ماڵی خەڵکی
وەک گەزۆومازوو دەخۆن .

**گەل وهۆز :**
ئەو کەسانەی کە سەروە ـ
یەک گەل وهۆزن ،زمان و
داب وشوێنی کۆمەڵایەتی یان ،
وێک دەچێ .

**گەڵ وگون :**
بە باتوو نێوگەڵان دەکو ـ
ترێ ،مام‌گورنەتەڵە دەڵێ :
خزی خزی داخزی گەڵ وگونت
داخزی .

**گەندو گوو :**
زۆری واهەن‌زمانیابەخۆشی ناگەڕێ
وهەر شتێک بە کەیفیان نەبوو
دەڵێن : ئەو گەندوگووەچیە ؟

**گەورە وگران :**
جاری وایە بەڵای گەورە و
گران بەسەر پیاوی دێ .
تۆخوا یەکی گەورەوگرانی
پێغەمبەری ئاشناکەخانی
"مەم‌وزین ل، ٧"

**گیاوگۆڵ :**
بەبەرگی سەوزوسووررازاوە
قەدولاپاڵ وشیوودوڵ
چڕۆی دەرکردووە داروملی
دایەکتری گیاوگۆڵ
"تاریک وروون ل، ٨٦"

**گێچەڵ وگۆنگەڵ :**
لەبەر ئەوەی کە دوژمن بە
گێچەڵ وگۆنگەڵە دەبێ وەک
مار سەری پان بکرێتەوە .

**گێرە وکێشە :**

**گێژو حۆل :**
پێچەوانەی گێژوحۆل،وریا و
وشیارە ،پیاوی گێژوحۆل زۆرلە
مەبەستی قسان حاڵی نابێ .

**گێژوکاس :**

باوەڕ هەیە لامو تۆش
دەناسم
لەو پێوە کەساس وگێژ
وکاسم
"مەم وزین ل١١٣٠

**گێژوور :**
لەو خۆشی یە هەردو گێژ
و وڕمان
بێ ورتە ولاڵ وپاڵ و
کڕ مان
"مەم وزین ل٧٠

**گێژو وێژ :**
چۆن پەنێ بدەم دەبێ
چبێژم
تێماوم وکاس وگێژ و
وێژم
" مەم وزین ل٧٠ "
وتی :تۆخۆت ئەزانی
شوری لەیلا
سەری واگێژ ووێژ
کردم لەمەیلا
"دیوانی پیرەمێردل١٩٢٠

**گێل و وێل :**
پیاوی گێل ووێل سەرەودە-
ری هیچ شتێک ناکاو پاش و
پێشی کاری خۆی نازانێ .
پێچەوانەکەی ،وریاوهوشیارە .

**گیروبەند :**
سەروزێری کەوشەکەم
دڕابوو ،دام بە پینەچی بۆم
گیروبەند بکا .
مەزنی گەلی کوردی مەرد
و رەندی
خاوەن دەسەلات وگیر و
بەندی
"مەم وزین ل، ٤٢"

**گیروگرفت :**
ئەو کارە بە هاسانی
پێک نایە بەڵکوو گیروگرفتی
زۆرە .

منتدى إقرأ الثقافي

# پیتی ( ل )

**لاق ولەتەر :**
ئەوەندە بە پێیان
ڕۆیشتبوو هەموو لاقی ولەتەری
بلۆق بوو.ها وتای لاق ولەتەر ،
لاق وقولە .

**لاڵ وپاڵ :**
تۆنەچیە زمانی لاڵ و پاڵە
بیرت لە دلا بێ مشت ومالە
لەوخۆشیە هەردووگێژوویڕمان
بێ ورتە ولاڵ وپاڵ وکرمان
"مەم وزین ل، ٥ ، ٦٩"

**لاڵ وپاڵ :**
وەختێ قسە لەگەڵ ئەو
کوڕەی دەکەن ،وەڵامی نیەولاڵ
وپاڵ دەبێ ،یا کەمێک پسکە .

**لانک ولۆرک :**
ئەو ژنە بەزیزی دوێنی بە
منداڵ ولانک ولۆرکەوە چووە
ماڵی بابی .

**لاوو لەرزانە :**
زۆر ژن هەن لەجیاتی
ڕاگەیشتن بە ماڵی خۆ هەر
زێڕوزەنبەر لە خۆیان دەدەن
وخۆیان بە لاوولەرزانە دەرا-
زێننەوە :
بە چیمپێ دەگری بەهانە
موبارەک لاوولەرزانە

**لق وپۆپ :**
یەکێک ماڵو دەکا یەک
دادەچێنێ تازەشیناوەرد
ئەوی ترهەڵدەپەرتێوێ ،
لق وپۆپی چلووکی دار
"تاریک وروون ل،٦٠ "

**لۆتک وپۆتک :**
ئەو ژنە بەهەر قسەیەک
لێو هەڵدەقرچێنێ وبە لۆتک
وپۆتکە .

**لۆمە ولەقەم :**
هەرچەندە خۆش رابوێرن
کەمە
چ ڕۆژی لۆمەولەقەمە
"بۆکوردستان ل،٥٤"

**لووت وبزووت :**
دوێنی لەشار لووت و
بزووت تووشی قادر هاتم .

**لووس وپووس :**
پێچەوانەی گرنی گرنی
وزبر ،لووس وپووسە .

**لێک ولووس :**

**لەتک وپەتک :**
کوڕێ کرلوەی لەت وپەتـــە ،
ژنان کە جلی خۆیان دەبڕن
برشت ولەتک وپەتک لەبەر
پارچەکە دەمێنێتەوە .

**لەت وپەت :**
ئەوبکرێ بەخەنجەران لەت
وپەت
بۆتۆلەیی مەم دەبێتــــە
دەرفەت
"مەموزیـــن ،ل، ٨٤ "

**لەت وکوت :**
وردوخاش :زۆرشتی واهەیە
کە بەعەرزی دابدەی لەت و
کوت دەبێ .

**لەڕ و لاواز :**
زۆر بووە بەرخێکی لەڕو
لاواز
بوتەخەرتێکــی دووگ
زەلام وقەڵەو
"مەلامحەممەدی کۆیی "

**لەساڵان ولەمانگان :**
کە میوانێکی خۆشەویستــت
دەچێتەماڵێکی ،پێی دەڵێـــن:
دار پیردەبێ جارێک باز لـــە
سەری دەنیشێ لە ساڵان ولـــە
مانگان ،ئەورۆ بەســــەرت
کردووەتەوە .

**لەش ولار :**(بەناز)

**لەنجە ولار :**(کریشمە)

نازوکرشمەولەنجەولارەکەی
پڕی کردبو هەمۆوشارەکەی
"تاریک وروون ل،٢٠٠"
تۆبەکنا چەولەنجەولارەوە
من بەچاوێکی فرمێســـک
بارەوە
"دیوانی پیرەمێردل٢٢٣"

**لەنگ ولۆر :**
شتێکم نووسیوە بۆت دەنێرم
هەر لەنگ ولووری یەکی بێ بۆم
دەست نیشان کە .

**لێدان وکوتان :**
دەبێ بە جێی لێــدان و
کوتانی منداڵان رووی خۆشیان
نیشان بدەن وئامۆژگاریـان
بکەن .

**لێرە ولەوێ :**
چم پێ بڵێن لێرەولەوێ
من کوردستانم خـــۆش،
دەوێ

**لێفە وبان :**
وەکو ،نوێن وبان وجێگەو ،
بان،بە کەسێک کە لە ماڵــی
خۆیا گەورە نەبووبێ دەڵێن :
لێفە وبانی بابی بەخۆیـــەوە
نەدیوە .

**لیپاو لیپ :**
یانی کەلاوەرێز و پر لە ئاو :
وەک دەڵێن جامێکی لیپاولیپم
دەخواردەوە .

# پیتی (م)

**ماتوپەشێو :**
تاوەتاوی نیەوا مـــاتو
پەشێو
لەشی زاماری دەکێشێتـــە
نشێو
"هەڵوی کاک سوار "

**ماتومەلوول:**(دڵ بەغەم)
هاوتای ماتودڵ تەنگـــە،
ئەوکچە ماتومەلوول دانیشتو-
وە ودەستی لە ئەژنۆکانـــی
هەڵپێکاون .

**ماچ و مووچ :**
کەشەوتێر ماچ ومووچ وگازە
کولمە
چبوو سوتاووتاوانگـــازە
کولمە
"نالەی جودایی ل ۷۲"

**ماڕومێروو :**(هەموو شت)
ئـەو دوکانە گەورەیـــە
سەری ماڕومێرووی تێدایە .

**ماش وبرنج :**
وەختێک مووی ردێن رەش و
سپی بێ،دەلێن ردێنی ماش و
برنجیە .

**ماڵ وحاڵ :**
هێندێک ژن بە چاکی بەماڵ
وحاڵیان رادەگەن .

**ماڵ ومندال :**
کۆڵی ماڵ ومندالت
تەزاندویەتی باڵت
"ملوانکەی شین ل۱۱۰ "

**ماندوو مردوو :**
لە ئاشی ئەوەندە کارم ،
کرد کە گەڕامەوە مانـــدوو
مردوو لەماڵەوە ، بـــۆی
کەوتم .

**مانگ ورۆژ :**
ئەستێرەومانگ ورۆژ لـــە
بەرزی
دەسمایەیی ژین وبـــوون
لە عەرزی
"مەموزین ل، ۱۱۵ "

**مردم وسووتام :**
هاتەوە بەردەرکەی ئەخت و
چارم کردومردموسووتـــام
نەهاتە ژووری .

**مردومودار :**
بەوکەسانە دەلێن مردوویان
لێ مردووە ،مردومودار پێو-
یستیان بە دڵخۆشی دانـــەوە
هەیە .

**مرچ و مۆن :**
وەک مۆڕومرخ ،زۆر کەسی ،

واهەن دەم بە پلیکەنین وسەرو
رووخۆش نین وگنجی نێوچاو ـ
یان نارەوێنن·ئەمانە مرچ و
مۆنن .

**مست وپێلاقە :**
سیری خوارد زمانی سووتا
گوتی:نابێ ،وەبەر مست و
پێلاقەیاندا .

**مشت ومالّ :**
ئەگەر خەنجەر مشت ومالّ
کەن دەدرەوشێتەوە .
مشت ومالّی دەوێ شاوێنەیی
ژەنگاوی خەیالّ
مەست وگێژمکە،هەتا گالّتە
بە جامی جەمکەم
"تاریک وروون ل،١٦١ "،

**مشت ومڕ :**
پشیلە پێک هەلّدەپڕژێن و
مشت ومڕ دەکەن .
ئەوان خەریکی مشت ومڕ
کردن
یەکێ لاپرەسەن هات و
لێی بردن
"شەڕەفنامە ل،٤٤٩ "

**مشەومشەمەڕ :**
واتە لەپەستاو بێ برانەوە،
ئەو مالّە مشەومشەمەڕ میوا ـ
نی لێ نابڕێ .

**ملک وماش :**
لەسوێی مالّ ودراوی بالّی
گرتبوو
خەیالّی ملک وماش·ومالّی
گردبوو
"نالّەی جودایی ل، ٧٧ "

**ملک ومالّ :**
پیاوی دەولّەمەند ملک و
مالّی زۆرە .

**ملّ ومۆ :**
بەدەوری لاشی نیوەگیانی
ئەودا،
هەزار گورگ وچەقەڵ
دەیکرد ملّ ومۆ .
"تاریک وروون ل،٦٥ "

**مووچە ومەزرا : (زەوی)**
هاوتای مووچە ومەزرا
زەوی وزارە ،بە دەشتێکی
یان کەکێلّدرابێ ودەغلّ و
دانی لێ چاندرابێ وگیا و
گوڵی لێ شین کرابێ ،مووچە
ومەزرا دەکوترێ .

**مەردوڕەند :**
لاوی ئازاوکوڕی مەردوڕەند
زۆرکچی گولّ بەدەم ولێو
قەندت

**مەردومەردانە :**
پالّەوانەکە لەپشتەوەڕا
بۆی نەچوو·بەلّکوو مەرد و
مەردانە روو بە رووی
چوو وبەرەنگاری بوو .

**مەڕومالّات :**

ئەوساڵ ساڵێکی خۆش بـــوو
مەروماڵات تێروتەسەل وبـــە
کەیف بوون .

**مەکروماجەرا :**

هاوتای فرۆفێڵە ،ئەو ژنــە
ئەوەندە بەمەکروماجەرا یـــە
کەس تێی ناگا .

**مێردومیوان :**

ماڵی جیرانەکەمان قــەت
بێ مێردومیوان نابێ .

**مێرگ ومێرغوزار :**

وەک چیمەن ولالەزار ،جێــی
بزوێن وپڕلە شینـــاوەردە ،
سەرەتای زۆربەی چیرۆکــــە
کوردی یەکان دەڵێ : وادی بە
وادی،تەختی موراد ،مێــرگ و
مێرغوزارێک بوو،چیمــەن و
لالەزارێک بوو .

**مێشت ومعانج :**

واتە هەرە لەهەموان ،بــە
مەڕمەڕەکەم ،هەم مەڕمەڕەکەی
تردەنگێوم هەم مەتەکەت دەخۆم
"مێشت ومعانج " لـــە یـــاری
مێشێندا بەکاردەبرێ .

**مێشک ودڵ :**

وەختی پیاو دەستدەداتــە
کارێکی دەبێ مێشک ودڵ وهۆشی
بداتێ .

نەدیاری بەناوی تۆدیارن
ئەوهۆیە کەمێشک ودڵ لـــە
کارن

"مەموزین ل، ٣ "

**مێش ومەگەس :**

هاوینان مێش ومەگەسێکــی
زۆر لەسەر زبڵ وزاڵ خــــڕ
دەبنەوە هەر دەهاروژێن .

**میراتگروبرابەش :**

وەختی کەسێک دەمرێ ملک و
ماڵەکەی لە نێوان براوخزم و
کەسی دابەش دەکرێ کە دەبنــە
میراتگر وبرابەش .

# پیتی (ن)

**نا زونا خون :**
ئێمە نا زونا خونین لێک
نا بین "زا را وە" نا زونا خون
نەخوشێکی قا مکا نە .
**نا زو نووز :** (غەمزە)
**نا زونیمنا ز :**
وەک قروفرٍ، لە ولاوەستێ بە
با وەشی وا ز ، پێشوا زی دەها ـ
ـ تبە نا زونیمنا ز .
**نا سک ونا زدا ر :**
نا سک ونا زدا روشۆخ وشەنگ.
تەنک وشلک وجوا ن و
چەلەنگ
"تا ریک وروون ل،٢٢٤"
**نا سۆر وبرین :**
نا توا نم پرێسکەی دڵم
لای کەس بکەمەوە،دەنا نا سۆرو
برینی زۆر تێدا یە .
بۆمنی با بردەڵەی
گردەنشین
بۆمنی دڵ پرٍ لە
نا سۆروبرین
"نا ڵەی جودا یی ل،١٦٠ "

**نا ڵ وبزما ر :**
کا ری نا ڵبەند قەیا ر
کردن ونا ڵ وبزما رکردنی یەک
سما نە .
ویرەی جلیتو دا را ن
خرمەی نا ڵ وبزما را ن
"تا ریک وروون ل١٠۶"
**نا ن وئا و :** (بژیو)
نا ن وئا و دووسەرچا وەی
گرینگی ژیا نن .
ئەوسا ڵ خەوتسا ڵە من
رەنجبەری تۆم
بەنا ن وئا ووجل وبەرگی
خۆم
ا "دیوا نی بێ کەس"
**نا ن وپێخور :**
دوێنی نا ن وپێخورما ن
هەڵگرت وبەرەوبا غ وەرێ کەـ
وتین .
**نا ن وچێشت :**
ئەو ژنەلە نا ن وچێشت
سا زکردنێدا دەستا وی خۆشە .
**نا ن وخوا ن :**
کەسێک مێردومیوا نی
زۆر بێ دەڵێن بەنا ن وخوانە .
چلۆن با نگێشتنێک مەرخوا
بزا نێ
چکەس نەیدیوە ئا وا نا ن
وخوا نێ
"شەرەفنا مە ل،٧٥٥ "

**نان ودۆ :**
هەمووکەس حاڵی شڕە
دوژمن نان ودۆبڕە
"تاریک وڕوون ل،٩٧"

**نان ونمەک :** -
نان ونمەکی ئەومالەم زۆر کردووە.چاکەم لەچاویدا هەیە

**نرکە ونالە :**
کابرای پیر وەختێک بە ڕێدا دەڕۆیی دەستی کرد بە نرکە ونالە . نرکە ونالە نیشانەی ناساغیە .

**نوقڵ ونەبات :**
لە شایدا لە ڕۆژی شیرن خواردنێ نوقڵ ونەبات دەبەـ شنەوە .

**نوێژو ڕۆژوو :**
کابرای بە نوێژو ڕۆ ژوو ، وخێروخێراتە بەفکری هەموانەوە هەیە .

**نوێن وبان :**
وەکو جێ وبان پێخەف و ڕاخەر،هاوینان هێندێک کەس نوێن وبانیان دەبەنە سەربانی ولەوێ دەنوێن .

**نووک وبەد :** (سەرلەنوێ)
هاوتای نووک وبەد،سەرلە بەرە ،ئەوی بۆخۆم دیتبووم و بەسەرم هاتبوو لە نووک و بەد بە تێکرایی بۆم گێڕاوە.

**نەخۆش وسەرئێش :**
هێند پاڕاوە منیش نەخۆش وسەرئێش هەستام ،وەدووی کەوتم ئەگەرچی هەموو گیانم دێشا .

**نەخۆش ولەش بەبار :** (نەساخ)
ئەوکابرا چوارساڵ نەخۆش و لەش بەبار بوو .
هاوڕازونیازی دەردەداران
هاودەنگی نەخۆش ولەش بەباران
"مەموزین ،ل،٥٧ "

**نەدی وبدی :** (هیچ نەدیو)
دزوارە نەدی وبدی
نەگۆڕێ
سەرئاو دەکەون بە
تاقەچۆڕێ
"مەموزین،ل، ٥٤ "

**نەرم وشلک :** (لەتیف)
دەستی نەرم وشلکە بۆ
کاری مەزرا نابێ

**نەرم ونۆڵ :**
ناسک ونەرم ونۆڵن
خاوێنن سپی وسۆڵن

**نەرم ونیانی :**
پیاو دەبێ بەنەرمونیانی وبێ پەلەوهەلە قسان بکا .
جەرگی تۆبەرگی ژیانی
من بوو
گەوهەری نەرمونیانی
من بوو

"بۆکوردستان ل،١٤٢ "

**نەغدوپوخت (نەخت وپوخت )**

بریتیە لە ماڵ وداهاتی کەسێک بە تێکڕایی،هەرچی پارەی دەستکەوێ نەخت وپوخت دەیداتە دەست بابی .

**نەقڵ ونەزیلە :**

زۆربەی چیرۆکەکانی کورد نەقڵ ونەزیلەن ،کورتەچیرۆکێ کە پڕە لە ئامۆژگاری بۆچاکە کردن .

**نەوس وچڵە :**

نەوس وچڵە ئەوشتانەن کە وەبەردلی پیاوی نەوسن و چڵێس دەکەون .پیاوی نەوسن و چڵێس ئاواڵی خۆی بە نەوس و چڵەوە دەوێ .

**نەوەونەتیجە :**

ئەوەندە پیرە نەوەونەتیجی خۆی دیوە بەڵام عەقڵی منداڵێکی نیە . کوڕەزاو ،کچەزاو ،دەبنە نەوە ـ منداڵی نەوەش دەبنە نەتیجە .

**نەیهێنا ونەیبرد :**

بێ ئەوەی تێبینی ڕەچاوبکا نەیهێنا ونەیبرد، هەمووی بەدرۆ خستەوە .

**نێرومێ :**

ئەو دەرکەم بۆنێرومێ بکەوە .

**نێوک ودڵ :**

وەختێ ئەوهەواڵە ناخۆشە یان دامێ نێوک ودڵم بەربۆوە !

**ناوناوبانگ :** ( ناوبەدەرەوە

ناوناوبانگی نووسەری باش شاربە شارووڵات بە وڵات دەڕوا .

**ناوونیتکە :**

نێوونیتکەیەکی زۆریان دواخست وهەزاران بەیت و باویان بۆ رێک خست .

"پێکەنینی گەدا "

**ناوونیشان :**

هەر کەسێ نێوونیشانی خۆی نەلێ ناناسرێ .بۆشتی دۆزراوە ناوونیشان پێویستە،تا خاوەنی بیدۆزێتەوە .

**نیوەونیوەچڵ :**(ناتەواو )

ئەوساڵ دەغڵ ودان باش ڕەنێونەهات،پەڵەزەویەکەم داچاند و زۆریش پێی چارام و خۆمم لەگەڵ ماندووکرد،لەسەر ئەوەش نیوەونیوەچڵیش دەرنەهێناوەوخودا خودام بوو هەر بنە تۆوەکەی دەرهێنێتەوە !

# پەیتی (و)

**وت وویژ :**
زۆر کار هەن بەشەرِوکێشە نایە ،بەلاّم بە وت وویژ بە هاسانی یێک دێ .

**ورت وویرا ن : (خاپوور)**
مەغولەکان وەختێ هێرشیان هێنایە سەرئێرا ن دەستیان کردە تالاّن وبرِۆوولاّتیان ورت وویران کرد !

**وردوخاش :**
ئیستیکانەکەم کەوتەعەرزیو وردوخاش بوو .

**ورد ودرشت :**
هاوتای چکۆڵە وگەورەیە ،
کولوەبەفری درشت وورد
چۆن سەرزەوی کفن دەکرد
"بۆکوردستان ل، ٤٠ "
وردودرشتیان ئەهاتنە شوێنمان،
لەو دیارەوە دیار نەبووشوێنمانە
"دیوانی پیرەمێردل،٢٣٤

**ورد وگرد :**
ئەوکچە لەکاری ماڵێدا زۆر وردوگردە .
لێی وردبەوە ئەم وتارە وردە
هەرچەند بەرِواڵە وردە ،گردە،

**ورِوکاس :**
بەگەکردنی ورِوکاس
هێندەی هەڵرِشت
قسەوباس
"بەیتی سەرەمەرِ ،هەزار ".

**وشک وبرێنگ :**
پێچەوانەی تەرِوتلیسە ،
هاوینان کە جل وبەرگ دەشۆن وهەڵیان دەخەن ،بە تینی تاوی وشک وبرینگ دەبنەوە .

**وشک وتەرِ :**
وەختێک ئاور هەڵگیرسا ، وشک وتەرِ پێکەوە دەسووتێن .
وشک وتەرِ حەوزودەروو دیوارت
تازەوکۆن وخوێیا وپێوارت
"بۆکوردستان ل، ١٣٤ "

**وەتاغ وباڵەخانە :**
ماڵی ئەو کابرایەی سێ وەتاغ وباڵەخانەیەکی هەیە .

**وەتاغ وپێشخانە :**
ئاغایەکی بەوەتاغ و پێشخانەیە .

**وەخت وبێ وەخت : (هەمیشە)**

منداڵێکی شیرەخۆرەمان هەیە
وەخت وبێ وەخت دەگری .

**وەخت وسەعات :**(کات )

ژنی زگ پڕلە وەخت وسەعاتی
خۆیدا دەزێ .دوکتۆر بە
نەخۆشێکی گوت :وەخت و
سەعاتی ماوە دەنا ئەونەخۆشە
لە مردنە .

**وەستا وفەعلە :**

دەبێ زوو بچمەوە وەستا و
فەعلەم هەیە .

# پیتی (ه) .

**هات وچۆ :**

چەند جاری بچنە شوێنێک و
بگەڕێنەوە،هات وچۆی پێ
دەڵێن .

بەرەوتی نەرم و لەنجەوهات و
چوو
بڵێ کێت نەکرد بەباوک
مردوو ؟
"وەلی دیوانە ل٦٤،"

**هات ونەهات :**

بێتو هات ڕووی دەپیاوی بکا
هەموو شتێکی وەدەس دێت لە
نەهاتیش هیچی بەدەست نایە .

نابمە زێبواری کەلی هات و
نەهات
چارەکەم بەشکوو ئەوا هات و
نەهات !
"هەڵۆی کاک سوار "

**هات وهاوار :**

واتە دەنگ بەرزکردنەوە بۆ
فریاکەوتن .ئەوهات وهاوارە،
چیە ذات ناوە ؟

**هاروهاج :**

هێندێک مندالّی هاروهاجهەن
کە سواری لە ئەسپی دەهێننە
خوار.

**هاڕەوهاژە** :(هاشە)
شەپۆلی ئاوی خوڕێن هاڕەو
هاژەی دێ .

**هاش وهووش** :( وژژە)
بای وادە کە لە ڕەشەمەدا
تێ هەلّدەکا بەهاش وهووشێکی زۆر
بەفر دەباتەوە .
گێژەلّووکەش هاش وهوشی هەیە .

**هاوار وبانگ** : (فریا)
پیاوێکی زۆر چاکە،بەهاوار
وبانگی هەموو کەسەوە هەیە .

**هاوارو زریکە** :
وەک زریکە وهۆڕ ،هات و
هاوار ،مندالّ وەختێک پەلپ
دەگرێ دەستدەکا بەهاوار
و زریکە .دەنگی هاوروزریکەی
ئەومالّەدێنێتە کۆلّان .

**هۆش وگۆش** :(وریا)
ژیان بەبۆنەی عەزیزم
خۆشە،
هەرکەس تۆی نەوێ بێ
هۆش وگۆشە ،
دەلّێم بێ هۆش وگۆشم ،
موددەتێکە هەردەنالّێنم ؛
خودا رەحمێ بکەی بەمورغی
حەپسەی بێ پەروبالّم
"وەفایی ل٥٤٠ "

**هەرا وهوریا** :(هەلّلاّ وبگر)
هاوتای هەلّلاّوبگرە .هیچ
شەڕێک بێ هەراوهوریا نییە .
مندالّی ساوا هەراوهوریای
زۆر دەکەن .

**هەرچی وپەرچی**:(بێ سەرەوبەرە)
کۆمەلّ یا مالّی هەرچی و
پەرچی ئەوەیە کەس خەتی کەس
نەخوێنێتەوە و هەست بە
گەورەوبچووکی نەکا .

**هەرزان وتالاّن** :(کەم بایەخ)
شتێکی ئەوەندە هەرزان ،
بێ،کەوەکوو خۆڕایی بچێ .
هەرزان وتالاّن بە نرخی
سالاّن .
"مەسەلەی پێشینیان"
هاوتای هەرزان وتالاّن ،بە
لاش وحەلاشە .

چت کردچەقاندت باغی
بەرمالاّن ؟
ریشەم حازرن هەرزان و
تالاّن
"دیوانی سەیف ل٧٩ "

**هەڕوگیف** :
هاوتای هەڕەشەوگوڕەشەیە،
دەلّێ،لە هەڕوگیفی ئەو
کابرایە ناترسم .

**هەڕەشە وگوڕەشە** :
ترساندنی یەکێک بە قسەو
تووڕە بوون. خۆمندالّ نیین،

لەو هەڕەشە وگوڕەشـــــەی
بترسێین .

**هەستان ورۆنیشتن** :(تێکەڵاوی )
ئەوکابرایە هەستـــان و
رۆنیشتنی لەگەڵ خەڵک باشە .

**هەست وخوست** :(چرپە)
ئەومالە هێندە بێ هەست
وخوستن دەڵێی کەسی تێــدا
نازی .وەختێک دەست بـــۆ
کیسەڵ دەبەی هەست وخوستـی
لە خۆی دەبڕێ .

**هەست ونیست** :( داهات)
هەست ونیستی خۆم لەسەر
ئەوکارە دانا .

**هەل وپەل** :( چاک کوڵاو)
وەختێ گۆشت لەسەر ئاور،
بە چاکی بکوڵێ ،هەل وپـەل
دەبێ .هاوتای ورد ورد و
ریزاڵ ریزاڵە .

**هەل ومەرج** :( بارودۆخ)
هاوتای بارودۆخە .لـــە
هەل ومەرجی ئێستادا بیـر و
باوەڕی چاک پتر لە هەمـــوو
شتێکی دی دەتوانـــێ ولآت،
پێش بخا .

**هەڵس وکەوت** :
ئەگەرچی پیریشە هەڵـس و
کەوتی هەرماوە .

**هەڵات وبڕۆ** : ( پشێوی )
هاوتای ئاخوران وبخۆران
پێشوی یە .وەختی جێ یـەک
تالآن دەکرێ هەڵات وبڕۆ سـاز
دەبێ .

**هەڵسووڕ وداسووڕ** : (جووڵە)
منداڵ کەمتر ئارام دەبن
پتر بێڕووبەوێدا هەڵدەچەر ـ
خێن وهەڵسووڕوداسووڕدەکەن.

**هەڵگێڕ ووەرگێڕ** :گێران
ماسی لە تاوەیدا هەڵگێڕ
و وەرگێڕ بکرێ باشتر سوور
دەبێتەوە .

**هەڵلا وبگر** : (گوڕەڕە)
هاوتای هەراوهوریایە .
لە جێیەک هەڵلا وبگربـــێ،
کەس گوێ ناداتە قسەی کەس .

**هەڵم وبوغ** :
هەموو هالآوێکی گـەرم و
وشکەکە لە سووتەمەنـــی و
شتی تر هەڵدەستێ.بەتایبەت
لە چێشتی گەرم .
بەگەرمی دڵ وگرمەی پێ،
بوغ بکا وهەڵمی بڵندبێ .
"بۆکوردستان ل٦٤٠ "

**هەوا و زووخاو** :
برینێک کەوەبن بدا کێم
وهەوا وزووخاوی لێ دێتەدەر و
درەنگ سارێژ دەبێتەوە .
هەتوان دەتوانێ هـەوا و
زووخاوی برێن وەدەرخا وپندری
بکاتەوە .

**هەورازولێژ :**
زۆرجار ڕێگەی هەوراز و
لێژ پێکەوەن .
ڕۆڵەی کوردم فێری هەوراز
ولێژم
تازۆر بڕۆم زیاترئارەق
بڕێژم
"تاریک وروون "

**هەورازونشێو :**
هەزار هەورازو نشێـــوی
پێواوە تاگەیوەتە ئەمڕۆژە .

**هەورو مژ :**
زۆر ڕۆژی زستانان هەورو
مژە وچاو چاو نابینێ . بـە
هەوروموژ بەری ڕۆژ تاســـەر
ناگیرێ .

**هەوروهەڵا :**
زۆرجار بەری ئاسمان بــە
هەوروهەڵا دەگیرێ ودایدەدا ـ
تە باران ورەهێڵە،تا هەورو
هەڵا نەڕەوێ،هەڵتینابڕووکێنێ .

**هەیت وهووت :**
گوارەوکرمەک وهەیت و
هووت
هاتنە سەما بەتاق و
جووت
دیسان نیشەی کەللـــەم
بزووت
"فۆلکلۆر"

**هیلاک وشەکەت**(زۆر ماندوو)
هاوتای ماندووو مردووە .
ئەوکابرایەهێندەی بەردکێشاوە
هیلاک وشەکەت بۆی کەوتووە !

**هێدی وهێمن :** (لەسەرەخۆ)
پێچەوانەی هەڵەشەوهەڵــە
باشە .ئینسان دەبێ لەکاردا
هێدی وهێمن بێ .

**هێزوپێز :**(توان وگوڕ)
هێزی ئەوە هێزوپێـــزی
پێ داین
هەرخۆی لەبەرێوەرێزی
لێ ناین

**هێزوتوانا :**(برست)
هاوتای گوڕوبڕستە .
ڕۆژگار هاڕیمی وەک
ئەسپۆنی ورد
هێزوتوانای لێ بڕیوم
دەردە کورد
"نالەی جودایی ،ل٢٢"

**هێزوگوڕ :**
هاوتای بڕستە . پیاو لــە
هەڕەتی لاویدا بەهێزوگوڕە .

**هیچ وپووچ :**
دەس بەردەلەکاری هیچ
وپووچت
بەس بارکەلەمن گوناە
وسووچت
"مەم وزین ل١١٥،"

**هیواوئاوات :**
هومێد وئارەزوو .

# پیتی (ی)

یاڵ وبژ :

ئەو بۆرێکی کەفەڵ مازی
یاڵ وبژ بەژەنگاری کلک لـە
سەرچوانی دەبن دایە .......
"سوارۆی ئایشەگوڵ"
رەونێزەئێسک بڕو رەگ
پسێن
ئەسپ یاڵ وبژیـــــان
دەرەنگا بەخوێن
"شەرەفنامەل٥٣٨"

قاموسەکە .

لە لایەکی دیکەشەوە دەبێتە پنجێک کە بیرو باوەڕی خوێنەری لێ دەڕوێ،دەبێتە بناخە و بنچینەیەک کە ڕوانگەی وی لەسەر هەڵدەچندرێ . ئەو وێنەیە : مێوژێکە لە کەویژێک و گێوژێکە لە بارێک .دڵۆپەبارانێکە لەرێژنەیەک و یەکێکە لە لێژنەیەکپەرتووکمانێکە لە دەستەوارێک و دارێکە لە لێرەوارێک ، بڕێکە لەگەلێک و مەڕێکە لە مێگەلێک .

ئەو وێنە بەچاوگ (مصدر)ی چوونە کەرەگەڵ پێشبەندان و پاشبەندان و نێو(اسم) ان ...م خستووە و زۆر لکی لێ بۆتەوە و هەر لکەی هێندێک کەشم (صورت)ی پێوەیە .

هەر کەشمەم هەر بەتاقە رستە (جملە)یەک لێک داوەتەوە . ( مانا ،بارتەقای رستەیە ) کەوابوو مانام دەقاودەق بۆ نەنووسیون.بۆیەش چاوگم دەستنیشان کردووە کە هەر وەک لە نێوەکەی ڕا دیارە ، سەرچاوەکانی ئاوە ، بۆ کردار ( فعل) ە -کان و کرداریش ئەستوندەکی تاولێ زمانە و تێغەرەی پشتی ڕێزمان .

وابزانم لە رابردوورا تاکوو ئێستێ ٢٥ قاموس ، ( فەرهەنگ)ی زمانی کوردی پێکەوەنراون و سەرلەبەر و بەرە بەرە خودا پێمان رەوا ببینێ ئەوکارە ڕێک وپێک تر ،پوخت و پاراوتر ، لەبارتر وبێ خەوشتر بووە وبەرەو پێشکەوتن ڕۆیوە . بەرهەمی هەرە نوێ قاموس ڕێکخستنی زمانی کوردی قاموسە باوەڕ پێ کراوەکەی مامۆستا زەبیحی یە .

پێم وایە کاتی وەی هاتووە کە چەند لکێک لە داری پێ گەیشتووی قاموس ڕێکخستنی زمانی کوردی بڕوێ و هەر وەک مەعروف قەرەداغی مردووخی لە سەرەتای فەرهەنگی کشت و کاڵەکەی خۆیدا ڕایگەیاندووە ( فەرهەنگی کشت وکاڵ، بەغدا ١٩٧٣،٢ بەرگ ) : دەبێ زمانی کوردیش وەک زمانەکانی تری سەروبەندی ئێمە چەند جۆرە قاموسی تر وەک قاموسی زانستی

قاموسی پیاوە بەناوبانگەکانی کورد ، و قاموسی زارا ـ وەیی بەخۆیەوە ببینێ تا چاکتر پێداویستی یەکانی خەڵک پێک بێنێ .

بەدوای فەرهەنگی کشتوکاڵ ، ئەوا من گەڵاڵەیەکم بۆ سازبوونی قاموسی زاراوەیی زمانی کوردی ـ کە ئێستێ بە دەستانەوەیە ـ پێکەوەناوە ، کە بێتوو باش بێ وپەسند بکرێ هیوام وایە کەسێک یا چەند کەسێکی دی ئەو گەڵاڵەی بکەنە هەوێن بۆ داڕشتنی قاموسی زاراوەیی زمانی کوردی .

خوێنەری خۆشەویستم دوای خوێندنەوەی ئەو نامیلکەیە بڕچەکانی لێ هەڵاوێرە و سووچەکانی لێ هەڵوەژێرە و منیش ئاگادار کە بۆم بنووسە ، پێم بڵێ ولێم رابسپێرە . ئەگەر کەلکیشی نەبوو بەسەرم دادەوە ، ماڵی قەڵب سەروەساحیبی ئەگەر لێشم قەڵسی ، ئەوا پشتی من و داری تۆ !

تەها فەیزی زادە

**چوون لەگەڵ پێشبەندان :**

بۆ + تێ + وە + چوون = **بۆتێوەچوون** . وەک : لەبەرە گران نیە ، پێم خۆش بێ سەرم لەو کراسەیەوە بۆ تێوەدەچێ زۆر تەنگ نیە . یان : لەسەر خێران وەختێک ژنێ بهێنێ لە جل هەلگرتنێ دا ناهێلم زەبرت رێکەوێ ، بۆخۆم بۆت تێوە دەچم . زۆر دەربەستی مەبە .

بۆ + چوون = **بۆچوون** . وەک : تا ئەورۆ کەسێک وەلامی ئەو هەتەلۆکەی نەدیوەتەوە . ولامی تۆش زۆرباش نیە . بەلاء چاکی بۆچووی . یان :

بۆت دێنم بۆت دێنم ، بۆت دێنم لەو مورسایە
ئەگەر ئێران لێی نەبێ بۆت دەچمە ئۆرووپا یە

یان : بارێکی قورست بۆ تێک ناوم و بۆت داگرتوم .ناتوانە هەلی گرم و بۆم ناچێ . یان :

بۆ بازەرگانی دەچمە شنۆیە کراست بۆدێنم لەگولی لیمۆیە

یان : وەختێک هەلۆ دەیەوێ نێچیری بگرێ ، بۆی دەچێ و تێی رۆدێ . یان : من وای بۆ دەچم وتاری مامۆستاکەم هەلەی تێدا نەبوو .

بۆ + دەر + چوون = **بۆ دەرچوون** وەک : بە ئێمەی دەکوت لە چ شتێک مەترسن و وەختێک کە مووسکێک نەهاتی رووی تێکرد چۆکی دادا و لەبەرەکەدانەما وبۆی دەرچوو قەل فرێ کرد !

بۆ + لا + چوون = **بۆلا چوون** . وەک : پوولێکم دابوو بە براکەم دوێنێ چووم بۆلای کە لێی بستێنمەوە . یان : نیشانەیەکم بۆت داکردبوو کە بەتفەنگ پێوەی نێی . بەلام نەک هەر لەبالت نەکرد بەلکوو بۆلاشی نەچووی . یان : تا شتی تووبڕ هەبێ بۆلای شتی ئیشک و برینگ ناچم . یان : لەبەر ئەوەی پیاوێکی چاک نیە قەت خۆی تێ مەگەیەنە و لای لێ لادە و بۆلای مەچوو !

بە + ... + چوون = وەک : لاموایە بە سواری چووە نەک بە پێ یان . یان : لام وایە ئەوەندە سەهەندەیە بە هیچ ناچێ !

بە + سەر + ئەوە + چوون = بەسەرەوەچوون . وەک لەبیرت بێ کە کتێبەکەت لێ سووتاندم ، جا بە سەرتەوەنەچێ ، تۆڵەی خۆمت هەر لێ دەکەمەوە ! یان : لەکوێ بەلای منەوە هاتووی و کەنگێ لەدوی قسەی منت داوە ؟ کەوابوو منیش بە وەختی خۆی بستێکت بەسەرەوە ناچم . گلەییم لێ نەکەی ، دونیا رووی بێژینگە ، چۆنم دەبینی وات دەبینم .

بە + سەر + دا + چوون = بەسەرداچوون . وەک : لێیان خەفتام و قەرە بە قەرەیان رۆیشتم و لە جێیەکی دەگیرم خستن . کاتێک خوت و خافڵ بە سەریان دا چووم عەبەسان .

بە + لا + وە + چوون = بەلاوەچوون . وەک : کاتێک شتێکی لەنیوان خۆمان و خەڵکی دابەش دەکەین نابێ هەر بۆ لای خۆمانی دابشکێنین ، یان چ وەبەر کەس نەهێڵین . خۆمان پڕ کەین و خەڵکی قڕ . بەڵکوو چاک ئەوەیە زۆرتری بە لای خەڵکی یەوە بچین .

پێ + تێک ( دە + یەک ) + چوون = پێ تێک چوون . وەک هێندێک جل و بەرگ هەن بێتوو بیانشۆین پێی تێک دەچن . یان : ژنەکە قسەی ناخۆشی بە مێردەکەی کوت . مێردەکەی زۆری پێ تێک چوو .

پێ + چوون = پێ چوون . لە رێگایە زۆری پێ چووە . لە ئاشی دەیەوێ تێی هەڵێنێتەوە ! یان : هەرچی لەو کوڕەتوڕە دەبم و پێی دەکەم کە دەست بزێوی نەکا بەگوێی دا ناچێ و پێ ناچێ ! یان : لەسەر ئەوکارەخراپانەی کە خوی پێ گرتووە هەرچەند سەرکۆنەی دەکەن و تانەوتانووتی لێ دەدەن وجاری وایە لێشی دەدەن ، بەڵام پێ ناچێ . دوایە دەڵێی نە بای پێدا هاتووە و نەبۆران !

پێ + دا + چوون = پێ داچوون . وەک : بەو رێگایەی دا ، چووی بۆ شاری ؟ نا پێی دا نەچووم . یان : ئێستێ هەور و هەڵایە ، زۆری پێدا ناچێ کە دەبێتەوە تاووساو .

پێ + دا + هەڵ + چوون . پێداهەڵچوون . وەک : جارێکی

پێی داهەڵچووم، کۆڵەوار بووم . ئیدی بەسمە .

پێ + وە + چوون = پێوەچوون . براکەم لەحەجێ هاتووتەوە بەلاّم من هێشتا پێوەنەچووم و نەمدیوە. یان : بێتوو زوو سەر لەو برینەی نەیەشێنی وردە وردە دەتەنێتەوە و هەموو لەشت دادەگرێ و پێوەدەچێ ! یان : هەودا دەزووکە بەسیخمە ـ کەیەوە نووساوە دەگەڵ خۆی بردی . بەلاّم نەیدەزانی دەزووەکەی پێوەیە و پێوەچووە !

پێ + وە + هەڵ + چوون = پێوەهەڵ چوون . وەک: منداڵی وا هەیە تا دارێکی بڵیند دەبینێ ،پێوەهەڵدەچێ . ئیدی نازانێ بێتوو بەربێتەوە سەری تێدا دەچێ !

پێ + هەڵ + چوون = پێ هەڵچوون . وەک : دوو منداڵ لە بن دارێکی تۆپێنیان دەکرد لەناکاو تۆپەکەیان کەوتە سەر دارەکە و بە لک وپۆپێوە گیرساوە. هەرچەند دارەکەیان راتڵەکاند بەرنەبووە. یەکێکیان پێی هەڵچوو و هێنایە خوارێ .

پێ + هەڵ + ئا + چوون = پێ هەڵا چوون . وەک : ئی وا هەیە پێ هەڵا چوون بە کێوی چروهەڵەموتی لەبەر گران نیە و بۆی وەکوو ئاو خواردنەوە وایە . بەلاّم لە پێ هەڵا چوون بەشاخی ژیان زەندەقی دەچێ .

تێ + چوون = تێ چوون . وەک : لەو چەند دلۆپەدەرمانەی کە لە چاوتکرد هەر دلۆپێکی تێ چوو. یان ئەو خانووەی کە چەند رۆژ لەمەوبەر کڕیوتە چەندی تێ چووە ؟

تێ + دا + چوون = تێداچوون . وەک : ئەوەی هەمبوو، نەمبوو دام بە بنە توو بۆ داچاندنی مووچە کێلگەکەمان . لەبەر ئەوەی ساڵ خۆش نەبوو دەغڵەکەم بۆ رەنێو نەهات و بنەتووەکەشی دەر نەهێناوە. بەداخەوە تێداچووم !

تێ + ڕا + چوون = تێڕاچوون . وەک : وشیار بە ئێرە درک و داڵی زۆرە ، تێت ڕانەچن و بریندارت نەکەن .

تێ + رۆ + چوون = تێ رۆچوون . وەک : بۆ ئەوەی دەرزی

و تەبەنەت تێ رۆنەچێ نابێ لەبەر دەستانیان دانێی .

تێک ( دە + یەک ) + چوون = تێک چوون . وەک : ماڵــە مێرولەی بە دڵۆپێک باران تێک دەچێ . یان : لـــەمێـــژە نێوانمان پێکەوە نیە و تێک چووین . یان : کاتێک قسەکەم سەرلەبەر بۆ گێڕاوە رەنگی بەروویەوە نەما و زۆرتێک چوو .

زاوا لە بووکێ مەدە ،زاوا لەبووکێ مەدە

ئەگەر لەبووکێ بەەی تێک دەچێ دەسرەو ،

شـــەدە

تێک ( دە + یەک ) + و + پێک ( بە + یەک ) + چـوون= تێک و پێک چوون . وەک : لە زۆر بنەماڵان دا کاتێک گەورەی ماڵێ دەمرێ، رێ وشوێن وچونیەتی ژیانی ئاسایی مـاڵــەکـە تێک و پێک دەچێ .

تێ + وە + چوون = تێوەچوون . وەک : پێش پێـــت قـورە وشیار بە تێ یەوە نەچی .یان : پێمخۆش نەبوو ئەو کارەی بکەم ، بەڵام ئەوەندەیان لێ رائەسپاردم و هانیان دام و هەموو رێگایەکیان لێ بڕیمەوە کەمنیش بە ناسەرسەنگی پێیدا کەوتم وتێ یەوە چووم. یان : ئەو پێڵاوۀپارەکە لە پێـی کوڕەکەمەوە دەچوو بەڵام ئەوساڵ کە گەورەتر بووە پێی تێوە ناچێ .

تێک ( دە + یەک ) + هەڵ + چوون = تێک هەڵچوون .وەک : شەڕی قورس لەنێوان چاکان و خراپان دا هەیە . لـەو تێـک هەڵچوونەیدا جارجار چاکان سەردەکەون و هێندێک جاریـــش بەداخەوە خراپان زاڵ دەبن .

" چوون وەک : "

دەچم بۆ پێنجون پێنجم پێ دەچێ،هەتادێمەوە تاقەتم دەچـێ . یان : دوێنێ ئەوەندە سارد و بەستەڵەک بوو دەستم چووبوون. دەتکوت لێ پەڕین . یان : ژمارەی دراوەکەم درابوو لەکاتی شتوومەک کرین دا بە هەر کەسم دەدا بەسەریان دا دەدامەوە، چونکوو نەدەچوو . یان : ئەوکابرایە شەپلــە لــێ داوە ،

لایەکی بەدەنی چووە. یان : چوومە لای دوکتۆر گەلێک پوول و پارەم لەخۆم خەرج کرد و زۆرم چوو .

دەر + چوون = دەرچوون . وەک : وەها کەند و کۆسپ تەنگی یان پێ هەڵچنیوم، کە رزگاریم بۆ نیەودەرناچم و دەرەتانم نیە. یان : لەو تاقی کردنەوەی دوێنێ دا باشم لام وایە دەردەچم. یان : تفەنگەکەم پڕکردبوو ، بێ ئەوەی پەلەپیتکەکەی ببزێوم دەرچوو. یان : دەرچوو ئەو سەردەمەی برەم بڕەمی دەسەڵاتت بوو. یان : ئەو گۆوارە هەموو چوار شەممۆیان دەردەچێ و بڵاو دەبێتەوە. یان : ئەگەر بە وردی لێک بکۆڵینەوە ، بە خزم دەردەچین .یان : کەوشە رەشەکەم زۆر درەنگ دڕا و چاک دەرچوو .

رۆ + چوون = رۆچوون . وەک : تکایە بەجێی رووخەڵەکد مەڕۆ دەنا رۆدەچی . یان : نانی گەلا گەلا نەبێ بە گەرو رۆناچێ .

لە + بەر + چوون = لەبەرچوون . وەک : لەگەڕەکی ئێمە ژنێک زگی پڕ بوو وەختێک زا ، منداڵەکەی لەبەرچوو .

لە + بەر + ئەوە + چوون = لەبەرەوە چوون . وەک :پاش ئەوەی دوو سێ جار چۆغەکەیان بۆ شووشتووم تێک چووەوئیدی بۆ بەرم نابێ و لەبەرمەوە ناچێ . بێتوو بە سمرِ سمرِیش لەبەری کەم ، هەڵدەدڕێ . یان : دوای ئەوەی ئاشت بووینەوە . ئێستێ ئەوەندە یەکترمان خۆش دەوێ و جووتین کە تەنانەت دەرزیشمان لەبەرەوە ناچێ .

لە + بەر + یەک + چوون = لەبەریەک چوون .وەک : هەر کۆمەڵێک رێ وشوێنێکی تایبەتی هەیە و وەکوو کات ژمێر کاریێ دەکا .بێتوو داب و رێ وشوێنەکەی بە کەلک نیە لەبەر یەک چوونی باشترە .

لە + بال (پال) + یەک + چوون = لەبال یەک چوون.وەک : رەورەوەیەکم بۆ منداڵەکەم کڕیبوو پێی بڕوا ، وەختێک کە گەورەتر بوو ئەوەندی بەدارۆ بەردی دادا کە لەپال یەک

چووەو لە کەلک کەوتووە .

لێ + چوون = لێچوون . وەک : گۆزەکەم پڕکردبوو لەئاوو لەجێی خۆی دامنابوو . نمنم لێی چووبوو ،تەنانەت دڵۆپە ئاوێکیشی تێدا نەمابوو .

لێ + دەر + چوون = لێ دەرچوون . وەک : تفەنگەکەم پڕ کردبوو دامنابوو .بێ ئەوەی پەلەپیتکەکەی بترازێنم‌دەنگێکی لێ هاتوو گوللەی لێ دەرچوو .

وە + بەر + هەڵ + چوون = وەبەرهەڵچوون . وەک : لە تەنیشت دارچنارێکی لاولاوێک شین ببوو . لاو لاوەکە بەرەوسەر چلۆرکی دارە چنارەکە ،وەبەری هەڵچووبوو .

وە + ... + چوون = وەشتێک چوون .وەک : ئەو گوڵە وەو گوڵەی دەچێ .

وە + یەک + چوون = وەیەک چوون . وەک : ئەودوو برایانە ئەوەندە وێک دەچن هەر دەڵێی سێوێکن لەتت کردوون .

وێ + چوون = وێچوون . وەک : ساوڵە ،وێنا چێ بباری.یان: ئەو نووسەرە گەلێکزانا و بلیمەت و وێچووە .

هەڵ + چوون =هەڵچوون . وەک : چاک بوو زوو گەیشتمە چێشتەکەی ، بەغوڕەم دەکوڵی و قوڵتی دەدا ،دەنا هەڵدەچوو یان : وەختێک ئەو قسەم پێ گوت هەڵچوو ئەوی بەسەرزمانی داهات پێی گوتم . یان : کەچەڵ کەچەڵ هوسبەداری هەڵچوو چەرمی سەری لەبیر چوو. یان : هەڵستە سەرپێ و هەڵچە ( هەڵ + بچوو ) شەپێکی،، لەو قومارەدا دۆڕاندووتە. یان : دڕوویەکم لەپێی هەڵچووە تەواوێک جێیەکەی ژانێ دەکا .

**چوون لەگەڵ پاشبەندوپێشبەندان :**

بۆ + تێ + هەڵ + چوون + ئەوە = بۆتێ **هەلچوونەوە** .وەک : دایەگیان ، پێشوو زۆرم خزمەت پێ کردووی و ئەرکی سەر شانیشمە کە لە خۆمت خۆشترم بوێی . بەڵام سەردەمێک بۆ نەخۆشی پرزەی لێ بریبووم و پێم نەدەکرا پێت رابگەم. ئێستێ کە چاک بوومەوە و وەک گوێزێ ئازام لێ هاتووەتەوە. جا بۆت تێ **هەڵدەچمەوە** .

بۆ + چوون + ئە + سەر = **بۆچوونەسەر**. وەک : نابێ هەرچی منداڵ کوتی بە قسەی بکەی، دەنا بێتوو بزانێ دەستی وەبەردەستی ناهێنن و هەرچی بلێ بۆی **دەچێتە** سەر و ئیتر بەخۆی دەخورێ .

پێ + دا + چوون + ئەوە = پێداچوونەوە . وەک : پاش ئەوەی شتێکم نووسی پێدا **دەچمەوە** . نەکا وشەیەک یان مەبەستێکم لێ هەڵبواردبێ یان وەسەرم خستبێ ،یان بە هەڵە **چووبێتم** .

تێک ( دە + یەک) + چوون + ئەوە = تێک **چوونەوە** . وەک : دوو سێ رۆژ بوو پێکەوە ئاشت ببووینەوە ، بەڵام زۆری پێ نەچوو کە لە سەررا تێک چووینەوە .

تێ + هەڵ + چوون + ئەوە = تێ **هەڵچوونەوە** .وەک : سەردەمێک بوو لە پەستاو و بێ وجان کتێبم دەخوێندەوە . لە دوایی‌دا لێیان وەڕەز بووم و وەلام نان . بەڵام چەند رۆژێکە تێم هەڵێناوەتەوە و تێ **هەڵچوومەوە** .

**چوون** + ئە + سەر= **چوونە** سەر .وەک : تکایە لە خواری دامەنیشە **بچووە** سەرێ .یان : ئەورۆ وەها بەخۆی دادێ و دەچێ دەڵێی **دەچێتە** سەر شایی . یان : هەموو رۆژی هەینیان **دەچمە** سەر قەبران .یان: خوت وخافل **چوومە** سەریان تەقەم لێ کردن . یان : با لەسەر ئەو مەبەستەی نەڕوێن و **بچینە** سەر باسێکی دیکە .

**چوون** + ئە + پاڵ = **چوونەپاڵ** . وەک : ئەو وشەیە

**چووەتە** پاڵ وشەکەی تر و وشەیەکی نـوێـی لێکدراوی پێـک هێناوە .

**چوون** + ئە + ژێر = **چوونەژێر** . وەک : ئەو قسـەی کـە وا لەمنی دەگێڕنەوە من نەمکوتووە و ئی من نیە،کەوابووناچمە ژێری .

**چوون** + ئە + بەر = **چوونەبەر** . وەک : **مەچووە** بەر بارانێ تەڕ دەبی .یان : کوڕەکەم چەند رۆژە **چووەتە** بەر مەڕی .

وا دەگێڕنەوە ، شێخی سەنعان لەسەر ئەو هەموو لە خودا ترسی یە و موسوڵمانەتی خۆی ڕا ، بەقسەی کچە گاورێکی لـــە دین وەرگەڕا . بەڵام زۆری پێ **نەچوو** کە زانی بـــە هـەڵـــە **چووە** ، **هاتەوە**سەر ڕێی راست و بەزەوئیسلام ، کچەکـەشــــی وەدووی خۆی خست .

**چوون** + ئە + سەر + یەک = **چوونە** سەریەک . وەک:وەختێک ماش و لەپە و دانەوێڵەی دی هەڵتەکێنین ، دادەپەستێودرێن و جێی کەمتر دەگرن و لەبەر ئەوەی **دەچنە** سەریەک، قورستر دیاری دەکەن .

**چوون** + ئەوە = **چوونەوە** . وەک : ئە ژنە لە مێردەکەی زیز بوو ( تۆرابوو ) و **چووبووە** ماڵی بابی .

**چوون** + ئەوە + سەر = **چوونەوەسەر** وەک : بەخزمایەتی **دەچێوە** سەر کێ ؟ یان : لەسەر ئەو هەموو دەوڵەت وداها ــ ئەی را ، **چووینەوە** سەر هەواری خاڵی .

**چوون** + بوو = **چوون بوو** . وەک : **چوون بوو** گەڕانێ، هەتا ئێواری ناگەڕێنەوە .

**چوو** + ئاندن = **چواندن** . وەک : ژمارەی پوولەکەمدڕابوو **نەدەچوو** . **چوومە** بانک ،**چواندم** . یان : ئەتۆیان لە شایی بانگ هێشتووە ، بەڵام لە منیان نەگێراوەتەوە ، **نامچوێنێ؟**

**چوو** + ئاو = **چوواو** . وەک : هەر پوولێک بچێ پێی دەڵێن **دەچێ** .دیارە **چوواوە** . بۆیە وای پێ دەڵێن .

لێ + **چوون** + ئەوە = **لێ چوونەوە** . وەک : مریشکەکەمهێلکە

کەرە. بەڵام دەمێکە هێلکە ناکا و لە هێلکە **چووەتەوە** .

هەڵ + چوون + ئەوە = **هەڵچوونەوە**. وەک : شیرەکە **هەڵچوو** لەسەر ئاوریم داگرت. لەسەررا لەسەر ئاوریم داناو ئاورم لێ خۆشکرد. لە پڕێک **هەڵچووە**.

**چوون تێکەڵاوی نێوا ن ( ا سا می) :**

ئابڕو + چوون = ئابڕوچوون . وەک : کابرا یەکیا ن لەسەر دزی لە بەستێنێ چۆمی لە خیزی گرت ،وا شیا ن لێ نەکربا ئەو کارە هەر ئابڕوچوونی پێوە بوو !

ئیشتیا + بۆ + چوون = ئیشتیابۆچوون . وەک : ئەوەندە نەخۆشم چم پێ ناخورێ و ئیشتیام بۆهیچ شتێک ناچێ !

ئیشتیا + چوون = ئیشتیاچوون . وەک : پیاو نابێ ئەوەی ئیشتیای چوویە بیخوا ،تەقا بە بەدەنمان نەکەوێ .

بانک + دەر + چوون = بانک دەرچوون . وەک : ئەوجار نۆرەی کاک سوارە گەیشت کە بانک دانێ . بێ ئەوەی زۆری پێ بچێ پڕ بوو بانکی دەرچوو .یان : کاک ئەحمەد زۆر لە مێژە خودا پێی رەوا ببینێ ئەنگڕاوە وئیدی پەکی بەکاسبی، ـ یەوەنەکەوتووە و بانکی دەرچووە .

بز + چوون + ئەوە + ی + چاو= بزچوونەوەی چاو . وەک : ئەو کابرایە لەبن لێفەوە چاوی بز دەچووە .

بۆ + لە ـ دین + دەر + چوون= بۆ لە دین دەرچوون . وەک : شێخی سەنعان کچێکی گاوری زۆر خۆش دەویست ، بۆی لە دین دەرچوو .

بە + با + چوون = بەباچوون . وەک : دەغڵ و دانێکی زۆرم داچاندبوو. بەڵام سەرمالێی داونەی گەیاندێ.داخەکەم رەنج بەخەسار بووم و بەرهەمی حەول و دەولەکەم بەبا چوو.

بە + بنج + و + بناوان + دا + چوون + ئە + خوار= بە بنج و باوان دا چوونەخوار. وەک : کاتێک گۆوارێکی بە دەستەوە دەگرین و دەمانەوێ بیخوینینەوە ، نابێ سەرسەرەکی تێی بڕوانین . بەڵکوو دەبێ مەبەستەکانی لێک دەینەوەو لێیان بکۆڵینەوە و بە دڵی بسپێرین . بەکورتی بڵێین : بە بنج و بناوانی دابچینە خوارێ .

بە + پیر + ئەوە + چوون = بەپیرەوەچوون . وەک:وەختێک حاجی لە حەجێ دەگەڕێنەوە ، پێش ئەوەی بینەوە مالێ،خزم و

کەس و دراوسێ یەکانیان بە پیریانەوە دەچن و وێکـــڕ دەگەڕێنەوە ماڵێ .

بە + ... + چوون = بە...چوون. وەک : بە پێکەنینـەوە چوون . بە گریانەوە چوون . بەگریان چووە ماڵێ . یان : ئەویش هەر بە دەردی بابم چوو. یان : بە پێیان چووەتـە گەڕانێ .

بە + خۆ + دا + هاتن + و + چوون = بەخۆدا هاتن وچوون وەک : ئەورۆ زۆر خۆی تیفتیفە دەدا ، و بەخۆی وادەگـا و خۆی لەتەخم و تەدارەک دەدا و بەخۆی دادێ ودەچێ.هەردەڵێی دەچێتە سەر شایی .

بە + خەسار + چوون = بەخەسارچوون . وەک : ئەو جاجمە جاجمی چاکە ، ئەوی پێی بدەی بەخەسار ناچێ . یان:ئەنگێوەی چاکە ، هەر گوللەیەکی بی هاوێ لە نیشانەی دەدا .وفیشەکـی بە خەسار ناچێ .

بە + دوا + دا + چوون = بەدواداچوون .وەک : کابرا لە پێشدا دەڕۆیشت و من بە دوای دا دەچووم و شوێنیم بـەر نەدەدا ، تاکوو گەیشتمەوە سەری. یان: بەدوای ئەومناڵەی دا بچوو نەکا ون بێ .

بە + ڕێ + چوون = بەڕێ چوون . هێندێک کەس هەن ژیانـی بنەماڵەیەک، بگرە وڵاتێک بەڕێوە دەبەن بێ ئەوەی بـــۆی سەخڵەت بن یان خەمی بۆ دابگرن .ئی واش هەن تـەنـانـەت خۆشیان پێ بەڕێ ناچێ .

بە + ڕێ + وە + چوون = بەڕێوەچوون . وەک : هێندێـک ماڵ گەورەی باشیان لێ هەڵکەوتووە و بەچاکی بەڕێوە دەچن. لە تەنگانان ناکەون و بەردی سارد و گەرمیان وەبەر پێـی نایە .

بە + زایە ( ضایع ) + چوون = بەزایەچوون. وەک : بـــە دارەمێوەکان زۆر ڕاگەیەشتم ، بەڵام سەرمای ئەوساڵ کــاری لێکردن وهەموویانیوشک کرد . حەولەکەم بەزایە چوو !

بە + سەر + **چوون** = بەسەرچوون .وەک : پاش تەنگانان فەرعانەیە ، تەنگانان بەریان کورتە ،تەمی خەم دەڕەوێ و نەسەر دەچێ و بەسەر خۆشیان دادەکەوین .

بەش + چوون + ئەوە + سەر + بەش + گان = بەش **چوونەوە** سەر بەشان . وەک : هێندێک جار پێش ئەوەی بەشە میرات بە کابرایەکی ببڕێ ،دەمرێ و بەشی ویش بە میراتگرەکانی دی دەبڕێ ! جا بۆیە دەڵێن : یا خودا بەشت **نەچێتەوە** سەربەشان.

بەفر + چوون + ئەوە= بەفر**چوونەوە** . وەک : هەموو ساڵێ لەمانگی رەشەمەدا رەشانگ دەکەوێتە لاپالان و نوالە بەر هەلدەبن و رنوولەکوێستانان دەپسێن ، وردە وردە بەفر جۆر جۆرەی دەکەوێتێ و **دەچێتەوە** .

بە + فریو + چوون = بەفریوچوون . وەک : هێندێک کەس زۆر بەفروفێلن و خەریکن خەلکی بەفریو بەرن .ئێمە دەبێ زۆر ئاگامان لەخۆمان بێ و بە گۆنگەلی و تەلەکەی ئەوان بەفریو نەچین .

بە + فیرۆ + چوون = بەفیرۆچوون . وەک : جاری وا هەیە دەستکەوتی چەندساڵە و پاشەکەوتی وەکۆکراوو دەغلێ ودانی داخستراومان بە نەختێک کەمتر خەمی بەفیرۆدەچێ و لە ساجی عەلی دەدرێن .

بە + قەڵفەز + چوون = بەقەڵفەزچوون .وەک : ئەوکابرایە پانتۆڵێکی تازەی کریبوو بەکووچە باغێکی دا رابرد . لە ناکاو بەپەلی دارێکی پانتۆڵەکەی بەقەڵفەزچوو و درا .

بە + قین + دا + چوون = بەقین دا چوون . وەک :براکەم لێمان بە قیندا چووە و نایەوێ لەگەڵمان ئاشت بێتەوەوهەر خۆشمان تێ ناگەیەنێ !

بە + گەرو + رۆ + چوون = بەگەرو رۆچوون . وەک : نانی تازە نەبێ بەگەروم رۆناچێ .

بە + گژ + دا + چوون = بەگژدا چوون . وەک : هێندێک کەس هەن بەچاکی گوێ بۆ قسەی خەلکی راناگرن و بێ ئەوەی

لە مەبەستی قسەیان بگەن هەر لەخۆڕا لێیان وەدەنگ دێن و بەگژیان دا دەچن . پاشان تێدەگەن کەجێی بەگژدا چوون نەبووە. جا چ چاکە لەسەرە خۆ بین و بەجوانی گوێ بۆ قسەی خەڵکی راگرین .و دوای بیستن لێکی دەینەوە و ئەگەر جێی وەڵام دانەوە بێ ، بەگوێرەی قسەکە،وەڵام بدەینەوە .هەر وەکوو پێشینیان کوتوویانە : قسەی بگێڕە ، بیبێژە ،بیوێژە-

بە + هاوار + ئەوە + چوون = بەهاوارەوەچوون . وەک : زۆر کەسی واهەیە بانگمان دەهێڵن کە دەفریایان بێین . ئێمەش دەبێ زوو بە هاواریانەوە **بچین** .

بە + هەڵە + چوون = بەهەڵەچوون . وەک : بێتوو لەباتی پێنج ، شەش بنووسین وپێمان وابێ کە دروستمان نووسیوە ، بە **هەڵەچووین** .

بە + هیچ + نە + چوون = بەهیچ نەچوون . وەک : دوژمنی خوێڕی ئەوەی پێی دەکەی وبەسەری دێنی، ماوەیەک پێی ناچێ کە دەڵێی نە بای پێدا هاتووە و نە بۆران.دیسان دەست دەکاتەوە بە پیلان گێڕان و بەهیچ **ناچێ** .

بۆ + لای + کار + چوون + ئەوە= بۆلای کارچوونەوە .وەک : چەند ساڵ لەمەوبەر سەگێکی مەڕی بوو تێشووی شوانەکەی خواردبوو و قرتمی لەنانی بڕیبوو. شوانەکەش سەگ بە حەسارێکی پێکرد. ئیدی ببڕ ببڕ بۆلای ئەو کارە **نەچووە** و تەمبی گرتوو بوو .

بێ + سەر + و + شوێن + چوون = بێ سەروشوێن چوون.وەک: ئەو کابرایە چەند مانگ لەمەوبەر **چووبووە** سەفەرێ . زۆری پێ نەچوو .خاووخێزانی چەند کەسێکیان بەدوادا نارد بەڵام هیچ سەروسۆراغێکیان لێ وەدی نەهێنا و بێ سەروشوێن چوو !

توێخ + چوون = توێخ چوون . وەک : تێی دا شل وکوت بووم و ئەخت وچارم کرد و توێخم چوو نەهاتەژووری !

توێخ + و + لوێخ + چوون = توێخ ولوێخ چوون . وەک : تێی دا مردم وسووتام و توێخ ولوێخم چوو دیاری یەکەی لێ

وەرنەگرتم و بەسەریدادامەوە !

چاو + لە + قووڵ + ئەوە + چــــوون = چاولەقووڵەوە چوون . وەک : چەند رۆژێکە کورەکەم زۆر کز بووە وچاوی لەقووڵەوە چووە . هەر دەڵێی‌نانی نەخواردووە !

**چوون** + ئە + بن + باڵ = **چوونە** بن باڵ . وەک : ئــەو پیاوە ئەوەندە پیر بوو نەیدەتوانی لەجێی خۆی راســـت بێتەوە ، **چوومە** بن باڵی و شانم وەبن شانی دا و هــەڵــم هەستاند .

**چوون** + دە + فکر + ئەوە = **چوون** دەفکرەوە . وەک : جاری وا هەیە پیاو بەخەیاڵ دەچێتە مەدینە و بۆی دەڕوا و بیرو هۆشی بەسەر خۆیەوەنامێنێ و **دەچێ** دەفکرەوە . فکر و خەیاڵ وەک کۆتری وان ، لەپرێک هەڵدەفرن .

**چوون** + لە + دڵ + ئەوە = **چوون** لەدڵەوە . وەک : لــەو دوو بیروباوەڕانە پتر ئەوەیانم **دەچێ** لە دڵەوە و دڵــم زیاتر ئاوی لێ دەخواتەوە .

**چوون** + لە + گوێ + ئەوە = **چوون** لەگوێوە . وەک : ئامۆژ گاری یەکەی کە ئەوێ رۆژێ کردمت**چووە** لە گوێ مەوە و لــە بیری ناکەم .

**چوون** + ئە + حەج = **چوونە** حەج . وەک : کەسێکی کە**دەچێتە** حەجێ لە گەرانەوەی دا پێیەوە **دەچن** و پێی شادوشوکردەبنەوە ، ئەویش بۆیان دەستەو دوعا دەبێ و دوعا بۆ عومرو ماڵیــان دەکا .

**چوون** + ئە + خوار = **چوونە**خوار . وەک : وەختێکباران دەبارێ ، زۆر بەهەردی دا **دەچێتە** خوار .

**چوون** + ئە + راو = **چوونە**راو . وەک : جاروبار خەڵـــک **دەچنە** راوێ .راوی بەراز ، راوی رێوی ، .پێشــوو خــەڵـــک **دەچوونە** راوی حەوت شەوو حەوت رۆژان .

**چوون** + ئە + رێواس + ئان = **چوونە** رێواسان . وەک : مانگی خاکەلێوەیە و خەڵکێکی زۆر **چوونە** رێواسان .

**چوون** + ئە + زگ = **چوونەزگ** . وەک : شیرەکەم پـــاش کولاندن لەسەر ئاورگی داگرتبووە خوارێ وبەجێم هێشتبـــوو پشیلەیەک **چووبۆوە** زگی . هەستی لێ بڕیبوو .

**چوون** + ئە + زیارەت = **چوونە** زیارەت . وەک : دوێنـــێ **چوومە** زیارەتی مامۆستاکەم ، لەخاکی پای کەوتم و بـــە دڵ سوپاسی ئەرکەکانیم کرد .

**چوون** + ئە + ژووان = **چوونە** ژووان . وەک : ئەو کـــچ و کورەی کە یەکتریان خۆشدەوێ و حەز لێکدەکەن ، جاروبار لە جێیەکی دیاری کراو بە یەکتری دەگەن و بۆ یەکتر **دەچنە** ژووانێ و بۆ بە یەکتر بران ووتوویژ دەکەن .

**چوون** + ئە + ژێر + بار = **چوونەژێربار** . وەک : ئێمـــە نابێ بەهیچ جۆرێک **بچینە** ژێرباری چاکەی خەلکی و چاوبـــەرە ژێریان بین . دەنا ، رۆژێکی دێ کە بەچاومان دابدەنەوە و منەت باریان بین .

**چوون** + ئە + سەر + تەخت = **چوونە** سەرتەخت . وەک :نازانم ئەو پادشایە لە چ ساڵێکدا پادشایەتی دەستپێ کردووە و **چووەتە** سەر تەخت .

**چوون** + ئە + سەر + چاکی = **چوونە** سەرچاکی . وەک :چەند رۆژ پێش چەند کەسێک **چوونە** سەر وەیس دەستیان بـــەســـەر گلکۆکەی دا هێنا و لەخودای پارانەوە کە ئاواتیان وەدی بێنێ و لەوێش را **چوونە** سەر چاکێکی دی .

**چوون** + ئە + سەر + ماڵ = **چوونە** سەرماڵ . وەک : ئـەو کورە ژنی هێناوە . بابی ژنەکەی پێی کوتووە رۆڵە گیـــان لەبەر ئەوەی کەپیرم و کەس نیە بە ماڵ ودووکانەکەم رابگا لەگەڵ کچەکەم وەرنە لای من با بە یەک ماڵی بژین ،کورەکە بە زاوا بەندی **چووەتە** سەر ماڵێ .

**چوون** + ئە + سەفەر = **چوونە** سەفەر . وەک:

گوڵ نیشان هەی گوڵ نیشان ئەسمەر خـالـم پـــەریشـــان
یارم **چووەتە** ســەفـــەرێ دەسماڵی بـۆ مـن نیشــــان

چوون + ئە + سەیر = چوونەسەیر. وەک: لەمێژ بوو بە گەل نەچووبووینە دەرێ. دوێنێ نان وچێشتێکی زۆرمان هەڵگرت و بۆ سەیر چووینە باغی و لە سبحەینێ را هەتا ئێوارێ بەخۆشی رامان بوارد .

چوون + ئە + شەڕا + یی + مەرگ = چوونە شەڕای مەرگ . وەک : وەختێک ژانەکە لە پشتم دەوەستێ دەچمەشەڕای مەرگەوە

چوون + ئە + کەنگر + ئان = چوونە کەنگران . وەک : خەڵکێکی زۆر بە پیشک و بیلەکانی و مەساسەوە چوونە کەنگران .

چوون + ئە + گەڕان = چوونە گەڕان. وەک : چوومە ماڵی هاواڵەکانم بۆ دیدەنی . لەماڵ نەبوون . بۆم دەرکەوت چوونە گەڕانێ و تا درەنگانێک نایەنەوە. من چاوەروانیم کردن هەتاکوو هاتنەوە .

چوون + ئە + ماڵ = چوونەماڵ . وەک :پیاو وەختێک دەچێتە ماڵە خەڵکی، دەبێ چاوەروانی ئەوەش بێ کەخەڵکیش بچنە ماڵێی . ماڵیش بەهاتووچووە خۆشە :

چوون + ئەوە + سەر + هەوار + ئی + خاڵی = چوونە سەر هەواری خاڵی . وەک : چووبووین بۆ شاری و کەسمان لەماڵێ بەجێ نەهێشتبوو.وەختێک کە گەڕاینەوە ، کەسکیان بۆ لە ماڵێ خستبووین و بزگورێکیان بۆ نەهێشتبووینەوە و بەو جۆرە چووینەوە سەر هەواری خاڵی .

چوون + ئەوە + ماڵ = چوونەوەماڵ . وەک : وەختێک پیاو دەچێتەوە ماڵێ و دەبینێ میوانی هەیە ، شایی لەدڵیدا دەگەرێ و گەز گەز پێی باڵا دەکا و لە خۆشیان بەمیوانەکی دەڵێ : یاخودا بەخێرێی ، دار پیر دەبێ جارێک باز لەسەری دەنیشێ .

دڵ + تێ + چوون = دڵ تێ چوون . وەک : جاری وا هەیە پیاو دڵی بە شتێکەوەیە و پێی خۆشە هەیبێ و چاوی تێ دەبڕێ وبۆی دەچێ لە فکرەوە. ئەو دڵ تێ چوونە پیاو بەدەست

خۆی نیە .

دە + نێو + ئەوە + چوون = دەنێوەچوون .وەک : کاتێک سەردەمی منداڵی و هەرزەکاری بەسەر دەچێ و هەرەتی لاوی دەڕوا ، هێزروگوڕی پیاو لەکەمی دەدا و دەنێوەوە دەچێ ئەوجار سەری سپی دەبێ و حوکمی چاوی نامێنێ و ددانەکانی دەکەون و پیرو زۆرهان دەبێ .

رزق + چوون + ئە + سەر + پشتی + کەر= رزق چوونە سەر پشتی کەر. وەک : یەک بە یەکێ دەڵێ یاخودا بژیوی تۆ بچێتە سەر پشتی کەرێ و ئەتۆ پیادە بی و ئەو سوار، هەر بڕۆی و نەیگەیەی !

• رووح + دەر + چوون = رووح دەرچوون . وەک : بابی ئەو کابرایەی هێشتا لە نان خواردن نەبووبووە کە رووحی دەرچوو و مرد ! خودا لێی خۆش بێ .

رەنج + بە + با + چوون = رەنج بەباچوون . وەک : چەند ساڵێک بوو خەریکی کۆکردنەوەی بەیتان بووم وگەلێکیان خڕ کردبوونەوە . بەڵام بەداخەوە سەرپاکیانم لێ ون بوون و رەنجم بە با چوو !

رەنگ + چوون = رەنگ چوون . وەک : هێندێک مافوورەهەن کە زوو کاڵ دەبنەوە و رەنگیان دەچێ ،بەڵام بێتوو کریان خۆ رەنگ بێ رەنگیان ناچێ .

رێ + بۆ + چوون = رێ بۆچوون . وەک : بە دڵنیایی یەوە ناکرێ بڵێم بۆچی نەهاتووە ، رەنگە نەخۆشکەوتبێ ، رێشی بۆ دەچێ بەسەفەر چووبێ .

رێ + تێ + چوون = رێ تێ چوون .وەک : بەو قەرا روبڕیەی بۆخۆی داینا وە رێی تێ دەچێ بەو زووانە بگەڕێتەوە . جا مەگەر هیچ دەرفەتی نەبێ .

زراو + چوون = زراوچوون . وەک : رۆژی تۆڵەئەستاندن وەختێ زۆردار ، زۆرلێکراوی خۆی دەبینێ قەڵەمی دەست و پێی دەشکێ و زراوی دەچێ .

زگ + **چوون** = زگ **چوون** . وەک: پاشنیوەڕۆیە ژانێکم لە زگی وەستابوو ژان وپێچی وەهای پێدا دەهات هەر دەتکوت ئەوە مردم، کارم پێ نەدەکرا و بڕستی لێ بڕیبووم. پێم وایە زگ**چوونم** پێوە نووسابوو .

زەندەق + **چوون** = زەندەق **چوون** . وەک : دنیا هەروا هاتووە و هەروا شردەڕوا خراپ لە چاک ترساوە و ناشیرین لە جوان زەندەقی **چووە** .

سپی + **چوون** + ئەوە = سپی **چوونەوە** . وەک : هاوینان لە هێندێک کوێستانان بەفر **ناچێتەوە** و ڕەشانگیان تێ ناکەوێ و لە دووڕڕا هەر سپی **دەچنەوە** .

سۆی + **چوون** = سۆی **چوون** . وەک : کاتێک بە منداڵێکی بەڵێنی خواردەمەنێکی دەدەین ،تا دەیدەینێ وەختە سۆیی **بچێ** .

**سوورچوونەوە**= بەهاران لە کوێستانان لەجێی زەمەند و زەنوێر و بژوێن گوڵەمێلاقەولاّتی دادەگرێ و تا چاو هەتەرێ دەکا ،ولاّت سوور **دەچێتەوە** ،جێی لێ نەبێ دەڵێی بەهەشتە خەملیوە .

سەر + بە + هەنیسک+ ئان + ئەوە + **چوون** = سەر بە هەنیسکانەوە **چوون** . وەک : وەختێک منداڵ لە گریوڕا **دەچێ** دەبێ بیلاوێنێوە و ژیری کەینەوە ،دەنا خودا بەوێ ڕۆژێ نەکا سەری بە هەنیسکانەوە **دەچێ** و گەشکەی دەگرێ .

سەر + تێ + دا + **چوون** = سەرتێدا**چوون** .وەک : دیتم میوانەکانم هەر نەهاتنەوە ماڵێ ،کوڕەکەی خۆمم وەدوا خستن تاکوو بیان بینێتەوە و بیانهێنێتەوە ماڵێ . کەچی ئەویش بێ سەروشوێن **چوو** هەر نەهاتەوە، سەری تێدا **چوو**!یان: براکەی لە شەڕێ دا کووژرا ! بۆخۆی **چوو** کەتۆڵەی بستێنێتەوە ،بەڵام ئەویش سەری لەسەر ئەو ڕێیە داناو سەری تێدا**چوو** .

سەر + لێ + دەر + **چوون** = سەرلێ **دەرچوون** .وەک:وەختێک

شتێک تێک دەچێ ئی وا هەیەدەستی تێوەر دەداو هیچیشی لێ نازانێ لەبەر ئەوەی کە سەری لێ دەرناچێ،یەکی دەخاو ئاداری لەسەر پاداری ناهێلێ!

سەر + ئە + خۆشی + چوون = سەرەخۆشی چوون . وەک :
کاتێک یەکێک مردووی لێ دەمرێ سەرەخۆشیکەر، دەچنە مالێ، یان دەچنە مزگەوت یا شفاتیحەخوێندن،سەرەخۆشی لێ دەکەن . خاوەن مردووەکە بەو کارەی تەمی خەم لەسەری لادەچێ،ودلی دەکرێتەوە . سەرەخۆشی چوون بە دەردو مەرگی خەلکی یەوە بوونە .

شک + بۆ+ چوون = شکبۆچوون . وەک: پێست، وایە نووسەری ئەو کتێبەی کێیە ؟ شکت بۆ کێ دەچێ ؟

شک+ ئی + تێ + دە + چێ = شکی تێدەچێ . بۆی هەیە و شکی تێدەچێ ئەورۆ باران بباری .

قسە + بە + گوێ + دانە + چوون = قسەبەگوێدانەچوون وەک: ئەو کابرایە ئەوەندەی پێی دەلێن و رێنوێنی دەکەن،قسەی بە گوێدا ناچێ . یان : ئەوقسەم بە گوێدا ناچێ ، ئەو مامۆستایە زۆر لەسەرەخۆو بە تێرادیوی دەرسێ دەلێ .

قەرە + بە + قەرە + چوون = قەرە بە قەرە چوون .وەک : دزەکەم لەگیر خستبوو، زۆری پێ نەچوو خۆی لە دەستی راپسکاندم و خۆی لێ شاردمەوە ، بەلام خوداوراستان ، لە دووررا ، چاوم پێی کەوتەوە و وەدوای کەوتم و قەرە بە قەرەی چووم و لەگیرم خست .

قیمەت + چوون + ئە + سەر= قیمەت چوونەسەر .وەک : چەند سال لەمەوبەرشت ومەکت زۆر بە هەرزان دەکری ، بەلامئێستەکە قیمەتی هەموو شتێک چووەتە سەرێ و شتی وا هەیە کە هەر لە کرین نایە .نەخوازە لەشتی بە وەزن سووکوبەقیمەت گران .

گیان + دەر + چوون = گیان دەرچوون .ئەوەی گیان لەبەر بێ وەختێک دێ کە گیانی دەردەچێ و دێتە رێزی مردووان ! یان : ئەوەندە لاوازە کەپۆی بگری گیانی دەردەچێ !

لە + بەرە + گە + چوون = لەبەرەگەچوون . وەک :وەختێک لە رێگای ژیان دا دوو سێ جار تێک شکاین وژەبرمان وێکەوت نابێ لەبار بکەوین و لەبەرەگە بچین وجێ بۆدوژمن خۆش کەین .

لە + بیر + چوون = لەبیرچوون .وەک : چێشتەکەم لەسەر ئاورگی دانا و ئاورم لێ خۆش کرد. پاشان چوومە دەرێ و چێشتەکەم لەبیرچووە. دوای درەنگانێکی کە گەڕامەوە ، بۆ چرووک لەمالێ گەڕابوو وچێشتیش ببووە خەڵووز !

لە + بیر + و + هۆش + ئەوە + چوون = لەبیرو هۆشەوە چوون . وەک : وەنەوزم دەدا و تازە چاوم گەرم کردبوو و دەهات خەوم لێ بکەوێ ولەبیروهۆشەوە بچم، کەلەدەرکەیان دا .

لە + جێ + چوون = لەجێ چوون . وەک : لە پلیکانان بەربوومەوە و دەستم ئێشێکی وەهای تێ وەستا کە کاری پێ نەدەکرا . دیتم لەجێ چووە !

لە + چاو + چوون = لەچاو چوون . وەک : ئەو گۆرانی بێژە ئەوەندە بە ناوبانگ بوو کە لە هەر جێ یەک باس باسی ئەو بوو. ماوەیەک بوو گۆرانی بێژەکانی دیکە زۆری لێ دەدوان وپێی هەڵدەکالان! چاووزار کاری لێکرد ! ئەوجار دەنگی نووسا و نووزەی نەدەهات و لەچاو چوو ! بەلام من پێم وایە لەچاوچوون بۆی نیە .

لە + خرتک + چوون = لەخرتک چوون . وەک : مالمان دەگو- یستەوە لەوەختی بارداگرتن دا، پێ یەکم لەگرێچوودا. زەبری پێ گەیشت . زانیم کە لە خرتک چووە !

لە + دڵ + دەر + چوون = لەدڵ دەرچوون .وەک : ئەوقسە سووک و ناشیرین وکالانەی کە تۆ لە پارسەنگمت نا ، قەت لە دڵم دەرناچێ و وەکوو ناسۆرێکە لە سەردڵم ! یان :
دەنگم نووساوە بەگوڵە بەرۆژە، لەدڵم دەرناچێ قسەی ئەورۆژە

لە + دوا + چوون = لەدواچوون . وەک : چەند کەسێکیان

بۆ شایی بانگ کرووە ،ئەوانیش دێن بۆسەر شایی. بەڵام لە بەر ئەوەی لەدوای وی نەچوون رەنگە نەیە .

لە + دەس (دەست ) + چوون = لەدەستچوون .وەک :لەسلّی گرانی دا ئەو مەڕو ماڵاتێکی کە هەمبوو، پاکیانم لە دەس چوون بەلاّم خەم بۆدا نەگرتن .هەر سەر سەلامەت بیّ .

لە + دەم + دەر + چوون = لەدەمدەرچوون. وەک : قوتابێکم هەیە ،هێشتا نیوەی مەبەستم لەدەم دەرنەچووە نیوەکەی دیکەی دەلّیّ .

لە + دین + دەر + چوون = لەدین دەرچوون . وەک : رق هەڵستان شتێکی زۆر خراپە ، ئی وا هەیە وەختێک قەلّس دەبیّ هێندەی نامێنیّ فەراق بکا و لەدین دەربچیّ !

لە + روو + چوون = لەرووچوون . وەک : هێندێک کەس هەن پیّ کراوو روودا ماڵاون و بەهیچ ناچن ولەروو ناچن !

لە + رێسمە + چوون = لەرێسمەچوون .وەک : ئەو دەرکە ئەوەندە کۆن بووە کە کەلکی نەماوە ، هێندەی نەماوە کە چوارچێوەکەشی بێتەدەر ،لەبەر ئەوەی لەرێسمە چووە .

لە + غەزەب (غضب )+ را + چوون = لەغەزەبرا چوون . وەک : ئی وا هەیە زۆر بەرتەنگ و قەلّس ورق ئەستوورە و وەختێک رقی هەستا ولەغەزەبرا چوو زوو رقی نانیشێتەوە !

لە + کوت + و + تاس + ئەوە + چوون = لە کوت و تاسەوەچوون .هێندێک منداڵی بەر مەمکان هەن کەبە زەبرەوە دەگرین وهەنیسکان دەدەن و رەش هەڵدەگەرێن ولەکوت وتاسەوە دەچن !

لە + کیس + چوون = لەکیسچوون . وەک : زۆر جار پیاو دەرفەتی وەی هەیە لەگەلّ مامۆستایەکی بلّیمەت وهەلّکەوتوو قسان بکا و زۆرشتی لیّ بپرسێتووە ،بەلاّم لەو دەرفەتەی کەلک وەرناگیریّ وماموّستامان لیّ دوور دەبێتەوە وئیدی دەستمان پێی راناگا و هەلە بەنرخەکەمان لەکیس دەچیّ .

لە + گرێژەنە + چوون =لەگریژەنەچوون . وەک : ئێمە لە

ماڵ نەبووین میوان هاتوون وایان زانیوە لەماڵین زۆریان لە دەرکەی داوە ، ئەوەندەیان لێ داوە کە لاشیپانەی خراپ بووە و لەگرێژەنەچووە! هەر بەفوویەکی بەندە .

لە + گرو + ڕا + چوون = لەگروڕاچوون. وەک : وەختێک منداڵ پەلپ و بیانووی گرت وگریا وکەس نەبوو بی لاوێنێتەوە و ژیری کاتەوە و دەربەستی بێ، لەگروڕادەچێ وواهەیە گەشکەی بگرێ .

لە + مەیدان + چوون + ئە + دەر= لەمەیدان چوونەدەر . وەک : ژیان مەیدانە ، هەر کەسێک بەگوێرەی هێزی خۆی ، بە ناسەرسەنگیش دەبێ چەند رۆژێکی بارتەقای تەمەنی،ئەسپی تێدا لینگ بدا و تەقڵە و رمبازی بکا . ئیدی لەومەیدانەی نەچێتە دەرێ،دەنا خوێڕی دەناسرێ .

ماوەیەک + پێ + چوون = ماوەیەک پێ چوون .وەک : بۆ دیتنەوەی مانای ئەو وشەیە چەند قامووسێکم لێکدان ، ماوەیەکی زۆری پێ نەچوو خوداوراستان ماناکەم لەقامووسی زمانی کوردی بەرهەمی مامۆستا زەبیحی دا دیتەوە ، کە ماناکە پڕ بە پێستی بوو و دڵم ئاوی خواردەوە .

مایە + تێ + چوون = مایەتێ چوون .وەک : چەڵپێکی دی ئاو بە دەموچاوت داکە ، ئاوەکە خۆڕایی یە ومایەی تێ نەچووە .

موو + دە + بەر + ئەوە + چوون = مووده‌بەرەوە چوون . وەک : لەو دەمیەوە کە ئاشت بووینەوە ئەوەندە پێکەوە، جووتین و نێوانمان خۆشە کە،مووما ن دەبەرەوە ناچێ .

مێشک + ئی + سەر + چوون = مێشکی سەرچوون . وەک وەختێک منداڵ لە گرو رادەچێ وژیر نابێتەوە پیاو مێشکی سەری دەچێ . یان : ئی وا هەیە ئەوەندە زۆربڵێ یە سێ گرمەکی قسان دەکا و خەڵکی بێ واز دەکا و وایان لێ دەکا کەپێی بڵێن : دە بەسە مردووت مرێ . زۆرکوتن قورئان خۆشە

مێشکی سەرمان چووا .

نێو + دەر + چوون = نێودەرچوون . وەک : کەسێک نێوی بە چاکە یان خراپە دەرچێ نێوبانگی هەر بەوەی دەڕوا و خەڵک بەوجۆرەی دەناسن .

وا + وە + چوون = واوەچوون . وەک : تکایە نەختێـــک هەڵگەڕێ بۆ سەرێ یان داگەڕێ بۆ خوارێ و واوەچوو (بچوو) هەتا بڕۆم .

وێ + وە + چوون = وێوەچوون . وەک : تکایە کەمێک جێـە بۆ چۆل کە و وێوەچوو ( بچوو) هەتا بڕۆم .

هات + و + چو+ کردن = هاتوچو کردن . وەک : بە بەرئەو دووکانەدا هێندە مەیە ومەچووە ، ئەو هەموو هاتوچویـەت لە چیە ؟

هەترەش + چوون = هەترەشچوون . وەک : وەختێک مشـــک پشیلەی دەبینێ ، لە ترسان هەترەشی دەچێ .

بە + قوڕ + ئێ + دا + چوون = بەقوڕێ داچوون . وەک : قەرەچی بەقوڕێ دا چی قەت دەرنەچی !

داخ + چوون = داخ چوون .وەک : نووسراوەیەکم گەڵاڵـە کردبوو بۆ دەرخستن وبلاوکردنەوە .داخم ناچێ ، لێمون بوو .

سۆما + ئی + چاو + چوون = سۆمای چاوچـــوون . وەک : ئەوەندە چاووچرم بەسەر گووراران داگرتووە ، کە سۆمـای چاوم چووەا

شەیتان + چوون + دە + کەلێشە + یە + وە= شەیتانچوو ن دەکەلێشەوە . وەک : قەلسە ، تا ماوەیەکشەیتان چـووە لـە کەلێشەیەوە !

بە + مێرد+ چوون = بەمێردچوون .وەک : دوێنێ کچێک لـە گەڕەکی ئێمە بەمێرد چوو و بردیانە ماڵە مێردی .

بە + ڕەحمەت + چوون = بەرەحمەتچوون .وەک : بابم لە مێژە بەرەحمەتی خودای چووە .

لە + خێر + و + بێر + چوون + ئە + دەر= لەخێروبێـــر

چوونەدەر .وەک : ئەوا من دەستم لەو پوول وپارەی هەلگرت و لەخێروبێری چوومەدەر ..

**چوون** + ئە + خزمەت = **چوونە** خزمەت . وەک : دوێنێ چوومە خزمەت مامۆستاکەم .

گۆڕ+ بە + گۆڕ + **چوون** = گۆڕبەگۆڕچوون .وەک : دوژمن مردوو گۆڕ بەگۆڕ چوو !

بە + بووک + **چوون** = بەبووک چوون . وەک : ئەو شۆڕە کچە جوانەیان دوێنێ گوێستەوە و بە بووک **چوو** ،بەرووسووری بۆ مالّی مێردی .

سالّی + بە + هەزاری + **چوو** + بێ = سالّی بەهەزاری **چوو** بێ . وەک : دوژمن زۆری لێکردووم! بەلّام بەسەریەوە **نەچێ**، سالّی بەهەزاری **چووبێ** تۆلّەی خۆمی هەر لێ دەکەمەوە ولێکی دەردەکەین .

بە + تالّان + **چوون** = بەتالّان **چوون** . وەک : دوژمن نامەردانە وبێ بەزەیی دەستی بەمالّەکەمدا هێنا و ئەوی وبەردەستی هات ، هەلّیگرت وبەو جورەی ئەوی هەمبوو و نەمبوو بەتالّان **چوو** !

بە + خێر + **چوون** = بەخێر**چوون** . وەک : بێتوو بتەوێ ئەمن بەجێ بێلّی وبڕۆیەوە بۆمالّێ ،خوداتلەگەلّ بێ وبەخێر **چی** !

حەوسەلە + بە + سەر + **چوون** = حەوسەلە بەسەر **چوون** . وەک : جاری وا هەیە پیاو دادەهێزێ وحەوسەلەی بەسەر **دەچێ** و وازی نیەهیچ کارێکی بکا !

لە + سەر + لا + **چوون** = لەسەرلا**چوون** . وەک : برینەکە پێوە **چووە** وپێستی لەسەر لا**چووە** ! دەبێ هەتوان و شەلّتەی لەسەر دانێن .

لە + بەر + پێ + ئان + دا + **چوون** = لەبەرپێیان دا **چوون** . وەک : وەختێک حەشیمەتێکی زۆر خۆیان لە جێیەکی دەرباز دەکەن و بەرەوجێ یەکی دیکە هەلّدێن لەوانەیە

منداڵی ساوا لەبەر پێیاندا بچێ و بفلیقێتەوە !

لە + گژ + را + چوون = لەگژراچوون . وەک دوژمن پەڕی پێداگرتم و منیش تاکوو بۆم کرا ، لێی نەپرینگامەوە و لە گژی راچووم .

دڵ + بۆ + چوون = دڵ بۆچوون . وەک : ئەو کتێبەت کڕیوە کە بیفرۆشیەوە ، دڵم بۆی ناچێ . وپێم وانیە کە قازانجی لێ بکەی .

لە + خەو + را + چوون = لەخەوراچوون .وەک : پیاو لە پێش ئەوەی دا لە غورابی خەوێ راچێ چاوی لەسەر یەک دادەنێ و لە بیروهۆشەوە دەچێ .

چاو + لە + رەش + ئەوە + چوون = چاولە رەشەوە چوون . وەک: زورجار کەپیاو لە بلیندیکەوە چاو دەروانی چاوی لە رەشەوە دەچی وچاوی ریشکەوپیشکەی دەکا .

بە + هیچ + ئی +چوون = بەهیچی چوون .وەک : کورەکە نەخوش کەوتبوو پیش ئەوەی دوکتور بیبینی گیانی دەرچووا بەداخەوە بەهیچی چوو !

ترس+ چوون = ترس چوون .وەک : واهەیە پیاو سامی ری دەکەوی ولەشتیکی دەترسی.بەلام پاش ماوەیەکی سامی دەشکی و ترسی دەچی .

وەخت+ چوون = وەخت چوون .وەک : ئەورو بەخورایی زور وەختم چوو.بیتوو قەدری وەختم زانیبا ئەوەندەم وەخت نەدەچوو.

چوون+ لە+ کەللە+ وە= چوون لەکەللەوە.وەک :کاتیک پیاو شتیکی لی حالی دەبی دەچیتە کەللەیەوە و زور درەنگ لەبیری دەچیتەوە.

چوون+ ئەوە + سەر+ کار+ ئی + خراپ = چوونەوەسەرکاری

خراپ. وەک : بویە پەندی بەسەر دەهینن ،تاکوو ببر ببر **نەچیتەوە** سەر کاری خراپ وخەلکیشی پی چاوترسین کەین .

**چوون** + دە+ فکر+ ئەوە= **چوون** دەفکرەوە .وەک:کاتیک بیر لەشتیکی دەکەینەوە ودەمانەوی وەبیرخومانی بهینینەوە **دەچین** دەفکرەوە.

بە+ دز+ دەر+ **چوون** = بەدزدە**رچوون** .وەک :کابرای کەخوی بە پیاوچاک دەناساند وخەلکی باوەریان پیدەکرد بە دز **دەرچوو**.

چاو+ زیت + **چوون** +ئەوە= چاوزیت **چوونەوە**. وەک : لەتاریکایی شەوی دا کابرای دز خوی لە کەلینیکی مالەکەدا شاردبووە وحاشار دابووو و چاوی هەر زیت **دەچووە** .

لە+ نویژ+ **چوون** = لەنویژ**چوون** .وەک :پیاو بە زور شتان لەنویژ **دەچی** ودەبی سەرلەنوی دەس نویژ هەلگریتەوە .

لە+ قسە+ دەر+ **چوون** = لەقسە**دەرچوون** .وەک :بەمنت کوت چاک بخوینم بەداخەوە بەقسەم نەکردیو زیانم کرد. ئەوجار لەقسەت **دەرناچم** .

**چوون** + ئە+ پشت + ئی + شیر+ ئان = **چوونە** پشتی شیران . وەک : جاری واهەیە شتیک پەیدا نابی وبەهیچ پولیکی وەدەست ناکەوی. بەلام جار جار شتەکە زوربەگرانی وەدەست دەکەوی **ودەچیتە**پشتی شیران.

دل + لە+ خیل + ئەوە+ **چوون** = دل لەخیلەو**ەچوو ن**
وەک : ئەوەندەم برسی بوو ئاوم لەدلی دەهاتودلم لەخیلەوە **دەچوو** .

بون + بو+ **چوون** = بون بوچوون .وەک : کەمیک لەو چیشتەی بەزاری ئەو کورەی دابکە بونی **بوچووە** نەکا ئەستوور بی .

دە + بور + ئەوە + **چوون** = دەبوورەوە **چوون** .

وەک : ئەو کورە بە بونی دوکەلی دلی دەبوورەوە **چووە** پیی رابگەن .

بە + حەوا+ دا+ **چوون** = بەحەوا**داچوون** . وەک : بو چەقویەکی بەحەوادا **دەچم** نیمە ووەدەستم ناکەوی بەن برم ددانە .

چوون لەپاڵ قسەی پێشینیا ن دا؛

کۆسە چوو بۆ ریش،سمێڵیشی لەسەر دانا .

رۆژ دەچێ و قەزا (قضا) ناچێ .

هەر کەس هەنگاوێکت بۆ لا نەیە، دوو هەنگاوی بۆ لامەچوو.

چوون بەخۆتەو هاتنەوە بە خودایە .

کەر بچێتە بەغدایە نابێتە یەستر

لەدوای چووان ، مەچوو .

دەیانگوت: پشیلە گووت بەدەرمان دەشێ ،دەچوو دەیشاردەوە

ئاو بە ئاوەدانێ دا دەچێتە خوار .

سەرمان بچێ نوێژمان ناچێ .

ئەوەی دەچێتە باڵ ماڵان ،یاخودا کافری بێ بەحاڵان.

ئەوانەی دەچنە باڵ ماڵان ،یاخودا کافریان بن بە حاڵان .

لەبەر بای مەکێشە تووتنێ، لە هەورازان مەڵێ کوتنی ،

مەچووە سەر ماڵی بابی ژنێ .

هەموو رێیەک دەچێتەوە بۆ بانە .

کاران بەخرێکەوە دەچوو لەمانگای پیرێژنیان دەپرسی .

لە هەر شتێکی بترسێی هەر بەوی دەچی !

بە ئاودا چوو بە عەرزی دا خوڕا! .

وەک بەفری پار چوو .

پیس بە پیسی دەچێ .

ماڵی حەرام بە گەروی کەس رۆناچێ .

بەلاباران ، پیاو ناچێتە هەواران .

ئەوەی بچێتە راوە ماسیان قوونی تەڕ دەبێ .

نە مار لە بیری دەچێ کلک ، نە باغەوان کوڕ .

بچۆ بۆشارێک کەس نەتناسێ ،خۆت هەڵکێشە پڕ بە کراسێ .

لەئاشی زۆری پێ دەچێ لەرێگایە پەلەی دەکا .

رێوی بۆخۆی لەکونیوە نەدەچوو قانگەلاشکیشی رەگەڵ خۆی دەخست .

هەشتی پاک و نۆی پیس ، هەموویان چوون لەکیس!

بەمانگ بچورمیوانبە، بە ساڵ بچووسوڵتان بە .
لە قانگەلاشکیان پرسی ، بۆکوێ دەچی ؟ گوتی :با دەزانێ .
لە گوێدرێژیان پرسی ، بۆکوی دەچی ؟ گوتی : شەپ دەزانێ .
سوورت دی ، سەمات لەبیر چۆوە .
لەبەر خاتری خاتران ، دەچمە سەر دینی کافران .
لە کۆڵێ دەرچووین ، کەوتینە زنجیرێ .
وەختێک بە بنە وبنەچەکەی کەسێکی دا بچی یە خوارێ یا بە دۆست دەردەچێ یان بە دوژمن .

چوون لەپاڵ گۆرانیان دا :

دەچمە سەرکانی مرادان ،شەرعی خۆم دەکەم تەواوە .
ئەوساڵ حەوت ساڵە عەزیزم ، عاشقم بەگوڵێکی دەساوە (ساوا) .

دەچمە سەر نالەشکێنێ بەرامبەر بە بۆکانێ
یاری من زیدە جوانە ،باریکە ونەشمیلانێ .

دەچمە سەری سولتانی سێ روژان نایەمەوە
دەس (دەست) لە کێلان وەردێنم ،چلدانەی دەگرمەوە

بەختی خۆمو لێو ئالێ بە تاقی دەکەمەوە
ئەسمەران ،دولبەران ،دەبا بچین بۆ گوڵ چنین .

یاری من لە گەلی دایە بەقورئانی سەرپەرشین
لە خودای دەپاڕێمەوە ، خۆزگە بۆ یەکتر بژین

گوڵ نیشان هەی گوڵ نیشان ئەسمەر حالم پەریشان
یارم چووەتە سەفەرێ دەسماڵی بۆ من نیشان

هەر وایە ، هەر وایە پەنجەرەی زووی لە بایە
یارم چووەتە سەفەرێ ، ئاگات لێی بێ خودایە

دەنگم نووساوە بە گوڵە بەرۆژە
لەدڵم دەرناچێ قسەی ئەو رۆژە

سویندم خواردووە نەچمە حەجێ
حەجم بۆ بێتەکن لەجێ
تا ماچ نەکەم خاڵی خەجێ !

ئەو شەو نەبوو شەوێ دینێ
بەخەیاڵ چوومە مەدینێ
خزمەت پەریزادەی چینێ

وەرە ماڵەکەم قەت قەت مەچووە
خەمی سەد ساڵەم لەبیر بەرەوە

پێم لێ نێ ، پێم لێ مەنێ ، زەردە لەبەر کولێنێ
دەستم لەنێو دەستی نێ ، با بچین بۆلای گەرمێنێ

بۆت دێنم بۆت دێنم بۆت دێنم لەو مورسایە
ئەگەر ئێران لێی نەبێ بۆت دەچمە ئوروپایە

مالم لێرە باردەکا دەچمە داروبێداری
هەرکەس ئەتۆی لەمن کرد یاخودا بەردی لێ باری

باران بارانە سەحرا (صحرا)ی کرد رەنگین
یار خودا حافیز (حافظ)بەدلێکی غەمگین

کافرەی پێ نەزان بۆت دەرچووم لە دین
کۆبرای (کبرای) خالێ نەخشین

بە بازرگانی دەچمە شنۆیە
کراست بۆدێنم لەگولی هێرویە

هەرکەسی دەیکا مەنعی من و تۆ
لەمالی دەرچێ رۆژێ هەشت و نۆ

سەرکە سەنیرم ، تێر بکە شینم
دەچمە ئیجباری مەرگت نەبینم

کۆشکێکت بۆ دروست کەم لەبنەی سەهەندی
دەچمە سەر مالێی بە زاوا بەندی

دەچمە سەر کێوی ئاتێ ، دێنم ئاوی حەیاتێ
دەیدەم بەو پیرەپیاوەی چاوکەزالم بداتێ

**چوون لەگەڵ قسەی نەستەقی منداڵان :**

دووم دووم هەللاجی ، **چووینە** ماڵی مامحاجی ،مام حاجی لە ماڵ نەبوو ، هێلکە و رۆنی لێنابوو ،بەشی منیشی نەدابوو .

نیسێ کە **بچۆوە** ،بچۆوە ، کوڕەکەچەڵە دەتگرێ

تاوەکە ! وەرەوە ، وەرەوە ، کچە زێڕینەکەش دەگری .

**دەچمە** ماڵە جوولەکە ،قوڵتە قوڵتی کوولەکە ، **دەچمە** ماڵە ئەرمەنی ،قوڵتە قوڵتی سەمەنی ، **دەچمە** ماڵە موسوڵمان دەنگی یاسین و قورئان .

قامکی چکۆڵە بە قامکەکانی دی دەڵێ : **بچین** ،**بچین** .قامکی تەنیشتێ دەڵێ : بۆکوێ **بچین** ؟ ئەوی دی دەڵێ : **بچین** بۆ دزی .ئەوی دی دەڵێ : لەخودای نەترسین ؟ دوایین قامک دەڵێ : دەبێ بترسین .

حاجی لەگ لەگی گەڕگەڕی سیمان دەخوا بەشقی عەلی

لەئاسمانان تەبەق تەبەق لەعەرزیە کوچک و کەڵەک

ماندوو نەبی عەبا بەڵەک .

گورگا نەشەوێگورگا نەشەوێ بەرخەچکۆڵەکەم خەوی لێ بکەوێ لوورەی تۆی ناوێ لای لایەی دەوێ. دەڵێ لەماڵی ئێمەدوورەوە کەوێ .

**بچووە** ماڵی ئەبوو یابوو  وشترەکەی بکەبە تێشوو

خوری مەڕەکەی بکەبەداوەدەزوو  خۆی لێرە دەرکە زووبەزوو

**بچووە** ماڵی کوللە خۆرەکان  زمانی بەدیان ببڕەبەددان

چاوی ژنەکەی کوێرکەبەبیڵەکان  بەشکوو بەجارێ ببنەوە لە کۆڵمان .

مامە پیرە بۆکوێ **دەچی** ؟ **دەچمە** حەجێ و دێمەوە .

ئەدی ئەمن لەگەڵ خۆت نابەی ؟ دەوەرە رەگەڵم کەوە .

نیسێ نیسێ گرێ ،بابت **بچێتە** لەشکرێ ،قەپاڵ قەپاڵ گوی دا گرێ .

چوون لەگەڵ مەتەڵ دا

ئەوە چیە ؟ هەر بەدوای دادەچین و نایگەینێ ؟

ئەوە چن ؟ سواری نەزۆکی دەبم دەچم نەبڕانێ، دێنم نەڕوانێ

ئەوە چیە ؟ سەری یەکە وبنی دوو ،بە قوونی باب وباپیرماندا هەڵچوو ؟

ئەوە چییە ؟ کاچوو مادان ؟

ئەوە چیە ؟ چوومەسەر تەپۆلکێکی، بانگم کردە هاواڵێکی هەزار هاتن بەجارێکی ؟

بە جارێکی لەسەر ئاوێ ، دەچمە بن ئاوێ ؟

پەیدا دەبێ لە ئاوێ ،وەک بەفر لەبەر تاوێ ،دەچێتەوە سەر ڕەنگی ئاوێ ؟

چوومە دێیەکی،هیچ کەس تێدا نی،دوو بەرخم دەخوارد هیچ ئێسک تێدا نی ، سواری ئەسپێک بووم هیچ رووح تێدا نی ؟

ڕاست وچەپی دەچێ کنی،ڕێگا وبانان هەڵدەچنێ،دەچی ماڵان دایدەکەنی ؟

قەڵای گیچی ڕێی نیە تێی چی ؟

گای سوور، کلکم بڕی چوو ژوور ؟

**چوون** لەپاڵ زاراوەدا:

بۆ **دەچی** ؟ لەبەر چی **دەچی** ؟ چلۆن **دەچی** ؟ بۆكوێ **دەچی** ؟ بە چی **دەچی** ؟ كەنگێ **دەچی** ؟ لەگەڵ كێ **دەچی** ؟ بۆ چەند رۆژا ن **دەچی** ؟

رووح لە جێ یەكی سەختدایە و **دەرناچی** !

بووم بە قەتریك ئاور بە عەرزی دا **چوومە** خوارێ !

گوێی لەكلاوی **چووەتە** دەرێ .

ئەوەندە رقی هەستاوە ، بای دە برینانەوە **ناچێ** .

كەپۆی بگری گیانی **دەردەچێ** !

لێرەوارێكی وابوو كەلّی لێ **دەرنەدەچوو** .

لە جێیەكم دیوە ، هەرچی دەكەم **ناچمەوە** سەری .

قەڵەمەكەم ئێستێ بەدەستەوە بوو ،كەچی لێم ون بوو ،نازانم بە عەرزی دا **چووە** خوارێ یان عاسمان هەڵی كێشا ؟

بۆ لای كاری چاك ناڕوا وهەر سبەری لەكاری خراپ دەخورێ ، وا دیارە شەیتان **چووە** دەكەلێشەیەوە ؟

قەرەچی ، بەقوڕێ داچی !

ئەگەر ئێستێ **چووبای** كەنگێ دەهاتییەوە ؟

ئەو رێیەی بگرە و بەری مەدە ، **دەچێتە** بەرمالان .

ئەو **چووەتە** حەقان ،ئێمەماوین لە ناحەقان .

بۆ مەند وملایمی **دەچێتەوە** سەر بابی .دەلێی سێوێكن لەتتكردوون .

ئەو كوڕە ئەوەندە وەبابی **دەچێ** هەر بابی نەی كوتووە بڕۆ بەو لاوە .

داخم **ناچێ** ، ئەوكراسەی كڕیبووم ، لێم ون بووە !

سەد بریا بەبریای خودای یا ،دەستێك ولاقێكت نەبا ، بەلام وەمن **چووبای** .

یاخودا ماڵت ئاوەدان بێ، نەشێوێ و تێك **نەچێ** .

چەند رۆژێكە دەستنووسی وتارەكەملێ ون بووە ، دەزانم یەكێك لێی هەڵگرتووم ،لێم روونە كەلە گوڵاڵەی بەولاوەتر **نەچووە** !

ناردوومە ماستی بکڕێ چوونی ئەو چوونە بووە وهێشتا نەگەڕاوەتەوە .
وەرە چۆڵەمەشکێنەی لەسەر دڵخواز، لەبیرم بێ و لەبیرت چێ .
لەگەڵ بەخت وئیقباڵ چ دەکرێ ؟ بچمە سەر چۆمی سیروانێ ئیشک دەبێ .
نەچی لە رقان ئەوەندە چێشتەکەی بکولێنی کە ببێتە خەلۆز، وابوو،واچوو بەکار نایە دەبێ کار بکەین .
تەلیسمیان لێ کردووە، بزانین بەچی دەچێ ؟
ئەو کابرایە ئەوەندە چاکە بەکاڵە وپێتاوەوە دەچێتە بەهەشتێ .
کابرایەک بە کوڕەکەی خۆی گوت: نابێ بڕوێ بۆ هیچ کوێ، و دووسمکەت ناچێ بۆ دەرێ .
پەپوو، شیرەکەم هەڵچوو، خەتام نەبوو .
کەسێک بەکەرم بزانێ و حەقم لێ بخوا، بچێتە پەڕپەڕۆچکی ئاسمان حەقی خۆمی لێ دەستێنمەوە .
بانگتان هێشتبووم، لەبیرم چوو بێم،خۆ نەچووە بچێ، بۆ جارێکی دی .
میراتگرەکان لەسەر میراتی بەشەڕ دەهاتن یەکێکیان گوتی: من بەشی خۆمم ناوێ وبۆخۆتان . ئەوە لەخێروبێری چووە دەرێ!

**چوون لەگەڵ جنێودا**

خودای دەکرد چەندساڵ ، لەمەوپێش سایەی ویمان لەسەر لادەچوو !

خودایە نەی مرێنی،دوو مانگی ئازگار لەسەر رقی پشتی بکەوێ ،کەس نەبێ چوورە ئاوێکی بەگەروی دا بکا و لایەکی لەشی بە جێ وبانانەوە بچێ !

ئاسمان دوور و زەوی سەخت ، بۆ دەبوو ئەمن مابام ، لە شەرمان،هەی بەسەر تاشین چێ !

بسکت بەبرین چێ !

ئاخر بۆ هێندە پێ نەچووی ، بزانە ئەو خەڵکە لەسەر ئەو کارانەی کە دەیکەی چەندە قسەت پێ دەڵێن ! ئاە ونزوولەی خەڵکی رۆژێکی بۆت لەکەرم دەکەوێ !

ئەوەندە بە ئێرەوئەوێ دا دەچی ؟ خۆ جاو رابەڵ ناکەی ، یاخودا لەبەریەک چی !

بە سەرتەوە نەچێ ، شەرتە وەک مار پێتەوە بدەم !

خودای دەکرد تووشی گێچەڵێکی وادەبوو،سەریشی تێدا دەچوو سەروسکەی لەسەر دادەنا !

رەببی بێ سەروشوێن بچی ، کەس بە دەرد ومەرگت نەزانێ !

خودای دەکرد گیانت دەردەچوو و چاویشت پێ سپی دەبوو !

برۆ هەی پێ نەچوو !

ئەو هەموو ئەمەگەی لەگەڵم داوی لەلات هیچە . دوێنێ بە منت گوت : ئەتۆ هەر هیچت لەگەڵ من نەکردووە ، جا ئەوە قسەیە ؟ هەی رووت چێ !

ئەو هەموو هاتوچۆیەت لە چی یە ؟ بۆ لەگل ناکەوی ؟

خودای دەکرد بە دەردی بابم دەچووی !

بەقورێ دا چی ، بۆ درۆێ دەکەی !

پێموایە چۆتە شاری سابلاغ ،خودای دەکرد بەولاترەوە دەچوو و نەدەگەراوە !

قسەیەکی بکە وەقسان بچێ مردووت نەمرێ !

**چوونی** بی وهاتنەوەی نەبی ا

زور لە خوت **دەرچووی** و خوت پی زورە ا

رەببی هەزدیهای حەوت سەر **بچیتە** خەونیوە ا

**چوون لەگەل بەیتدا :**

لە بەیتی سوارۆی سنجانێ دا ،ئاوا هاتووە ... چەندم پێ گوتی سوارۆ، بەشقی خودای مەچووە ،مەتەرێزێ دەگەورەوگران خۆماوێ (خۆمەهاوێ) کە ناری دە سواران ...

لە بەیتی سواروی ئایشە گولێ دا ،ئاوا هاتووە :

ئەوە دەلێ سوار مەزنی،بەمن مەزنی،سەرت لەپۆلای چەنگت لە ئاسنی ،هەر قەلاتێکی دەچیێەی ئەتۆی لەبنی،ئەو حاکمێکی زەرەندەیە ئەتۆی لەکنی ، ئەوە سولتانی ئەستەمبۆلی لەبەر یامی چووکەلە سواری من نایەکنی .

لە بەیتی لاسە شۆڕی بالەکیان و خەزالی مەلا نەبیان دا ،ئاوا هاتووە :

کیژەکە دەمو لەعاست لە هەرزەکارەکە گەیشت ، بە بیانوۆی چوونە دەرێ ڕێی مالە بابی داگرت.

لە بەیتی ناسرومالمالێ دا ، ئاوا هاتووە :

بەبازن ،بەزولفی بەخەنە ، قامکی بە ئەنگوستیلە ،دەستی دەدا کوتەکەکی دارمەرحەمدەچووە دەوری ڕەشمالی مالمالێ ڕاستەی ڕەشمالێی ،بەزەندی بەبازن سەبرۆکەسە برۆ کە دەیکوتاوە ...

لە بەیتی سەیدەوان دا ، ئاوا هاتووە :

ئاوی کوێستانان دێنە خوارێ چەند بەتوندی، چەند بە تیژی، هەلدەڕژێنە بن سوورەگولی سەر بە گژنیژی .

دەجا ئەو کەسانەی خوداشناسن وەرن ڕەجمم کەن،کێ دیویەتی لەدەورەتی زەمانان لەسەر سێ کوڕان ڕا بووک بچنەوە مالی دەبابان، بەتارای سوورو هەر بە کیژی ؟....

لە بەیتی دمدمدا ئاوا هاتووە : بانگێکم وەبەر خولای ئەوی دیکەم وەبەر پێغەمبەری ئاخری زەمانێ،بانگی دیکەم وەبەر حەزرەتی عەلی، ڕۆژی جومعە وجەماعەتان سوار دەبێ لە دولدولی دەستدەداتە زولفە قاری ،دەچێتە خەزای گاورقرانێ بانگ دیم وەبەر سەوزەپۆشی لە حاجی خۆشی لەترشەکانێ ....

لە بەیتی لەشکری دا ئاوا هاتووە :

جا ، ئەمن دەچوومە جبەخانەی ئاغای چەلەنگ ،لێم‌دەردە-
کێشان پێنج سەد رمبی کوپ رەشی دارحەیزەرانی ... لێم
دەردەکێشان پێنج سەد مەتالێ گوێ فیلی کەرگەدەن، بن بە
جۆلانە ...لێم‌دەردەکێشان پێنج سەد بۆروبدە وکوێتی قاپ
رەشی کلک‌لەسەر چوانە ...

لەبەیتی گەلۆدا ، ئاوا هاتووە :

سەرکولمی ئەوێ نازدارێ بە من بمێنێ بە سوورەگوڵەکەی
دە ئەوەڵ بەهارێ ، ئەگەر بەحوکمی تەرزەوبارانێ بەمل یەک
دادەچوون لە ئەوبەر ئەوبەری دەکاولە سۆمایە .

لە بەیتی باپیر ئاغای مەنگوڕدا ئاوا هاتووە :

رەسواغای مێردیکانێ سوێندخۆرە بە قورئانێ
دەڵێ : دەشێوێنم لاجانێ مامەش بچنە تارانێ
تێیان دەخەم قڕانی ...

لە بەیتی مەموزین دا ئاوا هاتووە :

خوشکی ئەزت ببم بە قوربانە ، ئەمن جارێکی دەگەڵ پەریان
چوومە راوی چل شەوو چل رۆژانە ، لە پەریان هەڵبڕام ،لەمنی
کردەوە کرێوە وبارانە ،رێم سەرەودەر نەکرد ، کەوتمە شاری
جزیرو بۆتانە ، لەسەر کۆشکی پای زینێ دەبووم بەمیوانە ..

لە بەیتی خەج وسیامەنددا ، ئاوا هاتووە :

خەجیش‌لەگەڵ پۆلی کچان ،نەشمیلان ،ئاسکۆڵان ، دەچووە
گێلاخە ومەندۆکێ ، کچان بەداوێنی ئەو کێوو دۆڵانە ،وەردەبوو
ـ نەوە ، کوڕان بە لایەکی دیکەوە ...

لە بەیتی شێخی سەنعان دائاوا هاتووە :

ئەگەر دەبینم وردە خاڵی لەگەڵ قەدێکی شمشاڵی
جەرگ و دڵ بۆ وی دەناڵی ئەمن دەچم بە عەبدالی
تۆ نەتدیوە کیژی کالی ...

لە بەیتی بارام وگوڵندامدا ئاوا هاتووە :

ئەگەر شێت نەبی ونەبی دێوانە تۆوەکوومەجنوون‌نەگری‌بەهانە

لە بەیتی سەعیدومیرسەیفوددین بەگ (سعیدومیرسیف الدین) دا ئاوا هاتووە :

~~هاتووم~~ دانیشتووم بەسەرگەردانی،رووم نیە ئەگەر بچمەوە ئاوەدانی ،قەڵەمی تۆیە بۆخۆت دەزانی ...

لە بەیتی نازوخدردا ، ئاوا دەڵێ :

هاتنەخوارێ دەسرە و دەسماڵ روبەندلاچوون لەسەر خاڵ
بازنە دەشکێن و خرخاڵ بۆ بە قێژە و گاڵەگاڵ

لە بەیتی میهرو وەفادا ئاوا هاتووە :

وەختیشم لێ درەنگ بووە ،هاتۆتە وەختی بانگی ئێوارێ
چاوت بەمن بمێنێ بە ئەستێرەی رۆژێ ،کولمەت بەمن بمێنێ بەگوڵی هەنارێ .

سبحەینێ هەرچی زوترە بۆ مبچووە بۆ سەر کانی شێخان،کانی و رووبارێ ،باجیرەی رێگایە هەڵگرم ،بەدیتن و بۆنی یارێ ...

لە بەیتی شێخ فەرخ وخاتون ئەستی دا ئاوا هاتووە :

قەسەم بەزاتی سوبحانی گەڵێک ئەبلە وهیچ نەزانی
ئاورت داوێمە خەرمانی خۆشی نەبینی لە گیانی
لێمەتێک چێ سەر وسامانی ئازای بەندەنت بگرێ ژانێ
بەقورێ داچی تا دەتوانی داستون بێ لە سەپانی..

لە بەیتی کەڵ وشێردا ، ئاوا هاتووە :

جێگای پادشاهان ئێرە قەڵا بوو دەرک وپەنجەرەی سەرپاکتەلا بوو
لۆتی نەیان کردهیچ فکروئەندیش،بەرەوبارەگای پادشاچوونە پێش

لە بەیتی عبداللەخان مکری دا ، ئاوا هاتووە :

ئاغام ،عەقڵت پەشۆکاوەە یان پەریان دەستیان لێت داوە
دارەلەک بەقورێ گیراوە ئاو زۆرە دەڵێی سێلاوە
قۆڵێکی نەچووە بەولاوە گەنم و جۆمان نەدێراوە...

چوون لەپاڵ هۆنراوەکانی شاعیران دا ؛

**هێمن :**

ئەی ئەوانەی قەت لەبیرم ناچنەوە !
ئێستە بمبینن ، ئەرێ دەمناسنەوە ؟

**هەژار :**

بێهودەیە بیرو خەم ،دڵت خۆش کە برا !
پرسیار نەکرا ، بەشت درا ،هەرچی درا !
تۆ هێشتە نەهاتوویە جیهان رۆژی بەرێ
ئەو رۆژی دەبوو بچیە دەرێ،دیاری کرا

**گۆران :**

خوزگەم بە ساڵی رابردوو
عومری کورتی دڵداریم بوو
لەپڕ هات و لەناکاو چوو
یەک پڕ بەدنیا ئارەزوو
دەریایەک تاسە ئەمە دوو
جێ مابووم لەپاری مردوو !

**عەلی باپیرئاغا :**

شەماڵ دەخیلم بچوو بۆ لای لەیل
بۆلای لەیلەکەی بێ وەفاوبێ مەیل
پێشکەش کە نامەی دەروون لەغەمکەیل

**نالی :**

ئیسباتی خەت وخاڵە بەسەد دیدەیی گریان
ناچێتەوە ئەونوختە لەنێو دیدەیی تەڕدا

**پیرەمێرد :**

مەگری مەناڵە یا بەخەفەت دڵشکست نەبن
نەختێ لەلات ئەمێننەوە بۆبەهەشت ئەچن

**حاجی قادر کۆیی :**

یەکێکی نایەتەوە چوونیان هەر ئەو چوونە
لە شێخ و عالیم وجاهیل ،لەپادشاوگەدا

**زێوەر :**

گەرچی ئەرزی ،هێندبلندی وەختە لای من بچیە عەرش
واسیتەی سەربەستی وئیجرایی ئاینی منی ......

**ئەدەب :**

لەو رۆژەوەجانا ! نەزەرت لێمە کەلا برد،
چونی سەرومالم بەخودا هەر لەنەزەردا ،

**تاهیربەگ :**

نەماوە حالەت وژینم ،لەدەس چوو رووحی شیرینم
رەفیقان باکەن شینم ،سەدای گریەوفەغان بابێ

**صافی :**

سەبری ئەیبووبم لەکوێ بوو وعومری نووحم چۆن دەبێ
پێنج و دوو رۆژێکی ماوە،رووح کە چوو نایەتەوە...

**ثانی :**

دلیشم چوو گولیشم چوو،کە یاری گولعوزارم چوو
نەما ژینم ،لەگەل خۆشی بەتاراجی نیگارم چوو...

**صەفوەت :**

سەری عەقلم لە دەستم چووکەمال وهۆش وعیلمم چوو
ئومێدی وەسلی یارم چوو،مەدەد یا ساکینولبەغدا

**سۆزی :**

زەمان شێوا زەمین هاژا کە ئەو چوو
بەلێ کەوچوولە عالەم قەدری کەوچوو

**ئەدیب :**

ئاوارە و خوێن خۆرە مەگەر وامیقی عەزرام
لۆمەم چ دەکەن کوشتەوسەرگەشتەیی لەیلام
بۆ دانەیی خالت بەفریو چووم دلێ کێشام
غەرقی غەم وسەوداسەرو ئاشوفتەو شەیدام

**وەفایی :**

پەردەی کراسی لاچوو پشکووت بەهەردو لێوان
گول وشەکر دەباری لە کووچەی باغی سێوان

زولفی رژانەکولّمی وەدەرکەوتن لەنێــوان
شەمس وقەمەر هەلاّتن دوێنی بەنوێژی شێوان

**بیّ کەس :**

بیستو حەوتسالّە تالّە ژیانم
لەژێردەستی تۆ زۆر پەرێشانــم
وەئینسان ناچم عەینی حەیوانم
کەی رزگار دەبم مالّی وێرانم؟

**دلـّدار :**

بە یادی ئەو دلّەی تینــوو
کەچۆن هات ووەها شدەرچوو

**شێخ رەزا تالّەبانی :**

خزمینەمەدەن پەنجە لەگەلّ عەشرەتی جافا
مێروولە نەچێ چاکە بەگژ قوللەیی قــافــا

**کامران موکری :**

ئەوی لە سامانێزیک بێتــەوە
رەوشتی بەرزی بیر ئـەچێتەوە

**قانیع :**

چەن خۆشە کە ئەو رۆژە بلّێسەی گڕی ئاگر
وەک بەرقی غەزەب دێت ودەچێ لێرەوەتاچین

**شێخ سەلام:**

دەست مایەیی عومرم لەدەستم دەرچــوو
بە پەنجەی ئەجەل جەرگم کون کون بوو

**موحەممەد سالیح دیلان :**

پیّ لە خرتکچووی بەردی هەردی دەدرد
رەنگ هەلّبزرکاو بە هەناسـەی ســەرد.

**حەریق :**

گەر دەچمەوە ساحێب ،نیە هیچ مونیس و ساحێب
گەر دێمە سەقز ،ناری سەقەروا لە جگــەرمـــا

روژپەرە ساردە کزەی بای زریان کاتەبوژینی لەدەس چوو
گریان

"سوارە".

بەلەرزە دەچنەفریزوچنینی گریانەکاریان جیی پیکەنینی ا .
"سیف القضات "

**چوون لەناو چیروکدا :**

لەچیروکی داپیرە ومام ریوی ذا (دایە) پیرە چوو تیخەلەیەکی هینا وخیرا کلکی مامریوی پەراند.مامریوی گەلیک لە داپیرە پاراوە کە کلکەکەی بداتەوە. داپیرە کوتی : **بچووە(بچو)** شیرم بوبینە تاکوو کلکەقولەت بدەمەوە. مامریوی **چووە** کن بزن، کوتی بزن: شیردە بو داپیرە،داپیر کلکە قولەم بداتەوە. بزن کوتی: **بچو** بو کن دار، گەلام بو بینە تاکوو شیرت بدەمی .ریوی **چووە** لای دار،کوتی: دار گەلا دە بو بزن،بزن شیردا بو داپیردا، داپیر کلکە قولەم بداتەوە.دار کوتی: **بچووە** سەرکانی، ئاوم بو بینە تاکوو گەلات بدەمی . ریوی **چووە** سەرکانی،کوتی: کانی ئاودە بودار،دار گەلادا بو بزن ،بزن شیردا بو داپیردا،داپیر کلکە قولەمبداتەوە

**چوون لە چیروکی مەروکە وبزنوکەدا :**

کەهاوین داهات بزنوکە بە مەروکەی کوت :با **بچین** خانووچکەیەک بوخومان دروست کەین ،کە زستانی **بچینە** نیوی و خومان لە سەرماوگورگ و... بپاریزین .مەروکە کوتی: من دووگی خوم خوش بی ،خانووم بوچیە؟ برو بو خوتی بکە. بزنوکەش رویشت خانووچکەیەکی بوخوی پیکەوە نا . لەگەلکوو زستان داهات بزنوکە **چووە** خانووچکەکەیەوە

**چوون لە چیروکی گورگ وبزن دا :**

بزن **چووە** سەربانی مالی گورگ ودەستی کردبەتەپەتەپی گورگ قەلس بوو کوتی :

ئەوە کییە لەبانم تەپە تەپی دەکا ؟
کاسە و کەوچکم لی خولاوی دەکا
لە میوانانم شەرمەسار دەکا

بزنیش کوتی :

ئەوە منم منمنوکە دووچاوم پیوەیە،بز بزوکە

دوو شاخم‌پیوەیە،بیل بیلوکە کی خواردویە تیتلی مـن
کی خواردویە بیبلی مـن بیتە شەرە جەنگـی مـن
**چوون لە چیروکی ریوی ومریشکە قولەدا :**
مریشکە قولیک لەهەوارچیان بەجی مابوو وهەر لەهەواری مابووە.ریویک چووە زگی وکوتی :
دەبی هەر ئیستا بتخوم !
مریشکەکەش پیی کوت :
جاری لیم‌گەری باهیندیکی دی خوم قەلەو کەمەوە و جووچکان هەلینم.جا ئاغایەکی بەمالم، وەرە پیمان‌وەربە وبمانخو ولیمان تیر بە.
ریوی بەقسەی کرد وخوی لی هەلبوارد.پاشان مریشکـە قولە چووە کن مام‌هومەری راوکەر ونەقلەکەی لەنووکـەو بو گیراوە و زور دەستەوداوینی مام هومەرەی بوو کە پەندیکی بەسەر ریوی بینی . وایان دانا وەختیـــک مریشکەقولە جووچکەی هەلینا وریوی قرمی خوی لی خوش کردن وچووە زگیان ،بە مام‌هومەرەی رابگەیەندری.
سەردەمیک پی چوو مریشکەقولە جووچکەی هەلینان و ریوی بەدوای ئەو نوالەچەوزانەوە داهات و چـووە زگ مریشکەقولەی. رووی تیکرد و هەلـیدایـە :
هە چومە چومە دایک وجووچکان دەخـومـە
دنیا بە کەیفی خومـە
مـریشکەقولەش پیی کوت :
توخولا وامەلی، ئەمن دەترسیم.واچاکترە بلیی :
مام‌هومەرەی پشت کەندی بەخوت وبەتولە قەندی
کەولی ریویت بەچەندی

## بە ناوی خـودا

لە نامیلکەی "نۆبەرە"دا کە چەندێک لەمەوپێش دەرم خستبوو، گەڵاڵەیەک بۆ رێکخستنی قامووسێکی زاراوەی زمانی کوردی راگەیەندرابوو. لەو نامیلکە ناوبراوەدا گوتبووم : وەختی وەی هاتووە کە داری ئەستووری قامووسی زمانی کوردی چەند لکێکی لێ بێتەوە وەک قامووسی ناوی گیایەکانی مەڵبەندی کوردەواری، قامووسی ناوی پیاوە گەورەکانی کورد و... هەروەها قامووسی زاراوەیی زمانی کوردی. بۆ وێنە چاوگ (مصدر)ی چوونم دەکار کردبوو وبە بەربڵاوی لە سەرچاوەی چوون چەند کردار (فعل)م سازکردبوو وبۆ هەر کەشمە (صورت) کردارێک رستەیەکم هەڵبژاردبوو. نازانم-بەکەیفێتان بوو یا نا ؟

لەو نامیلکەیەش دا لەجێی کردار، ناو (اسم)م داناوە، هەر بەشێوەی پێشوو پێی دا رۆیشتووم. بۆ وێنە ناوی دەستم بەرچاو خستووە .

ئەوا بەخۆشی یەوە بە دەرخستنی دوو نامیلکەی نۆبەرە و هەوێن بەردی بناخەی قامووسی زاراوەیی زمانی کوردیم دانا. خوا یاربێ، هیوادارم کەسێک یا چەند کەسێک ئەوبناخەی هەڵدەچنن ودەبێتە کۆشک وسەرایەک .

گەڵاڵە داب داخستنە و هەوێن پێ گەیەنەری ماست وپەنیری

سەد مەنجەڵ شیرە . بیتوو دابێکی چاک و باشم داخستبێ و هەوێنێکی بەهێزم ساز کردبێ ، ئەوا خۆزگە بەخۆم ، دەنا ئەگەر بە پێچەوانە چ بڕ کارێکیشم لە دەست نەهاتبێ ئەوا سەلاّ لەخۆم .

سپاس بۆخوا کە ئەتوانیم ئەو گەلاّڵە رێ نیشاندەری بۆ پێک هێنانی قامووسی زاراوەیی زمانی کوردی ڕاگەیەنم . ئەوەش دەزانم کە لەزمانی فارسی و زمانی عەرەبیدا تا ئێستێ قامووسێکی زاراوەیی سەربەخۆ هەڵنەکەوتووە و ئەو قامووسە تاقانەیە .

٢ـ قامووسێکم لە ناوەدوانەکانی زمانی کوردی پێک هێناوە کە کەشفێکی نوێیە .

٣ـ لە کتێبی تازە لەچاپ دەرچووم ، "دربارۀ داستان عارفانۀ شیخ صنعان "دا دابێکی نوێ وتازە کەشف کراوم بەناوی " قیاسی" بۆ تۆمارکردن ونووسینەوەی بەیتەکان راگەیاندووە . بەوجۆرە ئەم سێ کەشفانەم بە ناوی خۆم بە ناوەندی بەرپرسی زانستی راگەیاندووە وژمارە ١٦٥/٦٦/١/١٨ یان دراوەتێ وبۆیان دیاری کراوە .

خوێنەری بەرێزم ، خودا لێت هەڵناگرێ هەرچی نووسیومە بەراست و چەوتەوە لێم وەرگری و بۆ هەرچی کووتوومە بە ناشیرین و دڵرفێنەوە ،بۆم لە ملی بدەی و ئافەرینم بۆبنێری!

مەبەستە نالەبارەکانم پێ رابگەیەنە تا لێت فێر بم و لە بیریان نەکەم .

تاها فەیزی زادە ـ تەورێز ـ سەندووقی پستی ٣١٣٨ ـ ٥١٣٣٥

"ماناکانی ناوی دەست " :

دەست چەند مانای هەیە کە لە رستەدا رادەگەیەندرێن :

١- ئەسپەکە دوو دەستی دادا و لە قوڕ چەقی . یا ، لەوەتی دەستی راست و چەپی خۆم ناسیوە ئەو شارەم هەروا دیوە . یا وەختێک ئەو هەواڵەم بیست ، سەرم سوڕ ما و دەستێکم کەوتە ئەملا ودەستی دیم کەوتە ئەولا .

٢- دوێنێ دەستێکم رانک و چۆخەکڕی .

٣- دەستێک ئیستیکان بە چەندی دەدەی ؟

٤- تەواوی کەوچکەکان یەک جۆرو یەک دەستن .

٥- وەرە دەستێک تەختە بکەین .

٦- بە دەستی راستدا بڕۆ دەگەیە سەر ماڵان .

دەست ، لەپاڵ ناوی لێکدراودا :

بە دەست وبرد= بە+ دەست + و + برد : ئی وا هەن زۆر لە کاران بەکاوەخۆو بە ساوەساون و کاریان زوو لەبەر دەستی رانا پەڕێ . ئی واش هەن بە پێچەوانە ٢ بە دەست و بردن . و هێندەی بلێی یەک و دوو ، بە کار کۆتایی دەهێنن .

هەڵنیشتووە لەو گردە ، جیقنەی دەکا زۆر وردە ، ئێجگار بە دەست و بردە . ( هەڵۆ ) " مەتەڵۆکە"

بەردەست = بەر + دەست . ئەو کەسەی لەژێر دەستی کەسێکا کار دەکا . " قامووسی زمانی کوردی ، بەرگی دووهەم ،عبدالرحمن زەبیحی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ،١٩٧٩"

یا : بەر دەستم مەگرە با بزانم چ دەکەم .

یا : هێزی خۆمان دوژمنیان بەر دەستکرد .

بەردەستان = بەر + دەست + ئان . ژوورێکە لەنێو ماڵی دەوڵەمەنداندا ، تەرخان دەکرێ بۆ دانیشتن و کاری نێو ماڵ تێداکردن . " قامووسی زمانی کوردی ، ب ٢ زەبیحی ."

ئەو مافوورە زۆر باش نییە ، لەدیوی بەردەستانی راخە پێخوستی زۆر لەسەر .

بەری دەست = بەر + ئی + دەست . رێگای ئەو شارەی بێ کەند و کلۆیە وەک بەری دەست .

یا : ئەو کارە بۆ من لەکردن نایە ، دە وەرە موویەکی لە بەری دەستم هەڵکەنە ، دەبیٚ ؟!

پشتی دەست : پشت + ئی + دەست . پشتی دەستی خۆم داغ کردکە ئەوجار ئەو کارەی نەکەم .

یا : پشتی دەستی ئەو کابرا پیرەم ماچ کرد .

چاو لە دەست = چاو + لە + دەست . سواڵکەر، چاو لەدەستە بۆ ئەوەی شتێکی بدەنیٚ .

یا : چاو لە دەست چاو بەرەژێرە،

ژوور دەست : ژوور + دەست . کەسێک کە دەستی دەڕوا ،ژوور دەستە . پێچەوانەی ژوور دەست ژێر دەستە .

ژێر دەست : ژێر + دەست .کەسێک کە دەستی ناڕوا و ژوور دەستێکی هەیە .

دار دەست : دار + دەست . هیچم لەگەڵ خۆم نەهێنا . بە داری دەستی وەدەر کەوتم .

یا : ئەو دارە دەستەم دەیە تاکوو وەگیانی دوژمنی کەوم .

دەستاو : دەست + ئاو . ئەو ژنە چێشتی چاک لیٚ دەنیٚ و دەستاوی خۆشە . ئەو ژنە ئەوەندە دەستاوی خۆشە کە چێشتی وا لیٚ دەنیٚ کە پیاو وەختە قامکەکانی لەگەڵ بخوا .

دەستنوێژ : دەست + نوێژ . پێش ئەوەی کە نوێژ بکەین دەبیٚ دەستنوێژ هەڵگرین .

دەستگران : دەست + گران . هاوتای دەستگران ، دەست قورسە .

دەستقەرز : دەست + قەرز . کاتێک کە دراومان پیٚ نامێنیٚ دراوی بە دەستقەرز لەهاواڵەکانمان وەردەگرین . دراوی بە دەست قەرز دەبیٚ زوو بدرێتەوە .

دەستخەت : دەست + خەت . کاتێک کە بە دەستی چەندوشەیەک بۆ کەسێک دەنووسین ، دەستخەتی پیٚ دەڵێن .

دەستخەرۆ : دەست + خەرۆ . کەسیکە کە تەفرە درابی .

" فەرهەنگی خاڵ ، ب ، ٢ "

دەستدرێژ : دەست + درێژ . دەستدرێژ کەسێکە کەدەستدرێژی

بکا .

دەستکورت : دەست + کورت . پیاوی دەستکورت هەناسە ساردە .

دەستقورس : دەست + قورس . بە کەسێک دەڵێن کە زەبری دەستی زۆر بێ .

دەستڕاست : دەست + ڕاست . دەستڕاستکەسێکە کەبتوانێ نیشانەی بە چاکی بنگێوێ .

دەستنیشان: دەست + نیشان .لەنێو چەند هەناراندا هەنارێکم دەستنیشان کرد و هەڵم بژارد .کاتێک شتێکی لەنێو چەند شتان دا دەستنیشان دەکەین ، واتە هەڵی دەبژێرین .

دەسترژد : دەست + رژد .

دەستبڵاو : دەست + بڵاو . پێچەوانەی دەستبڵاو.چنۆکە .

دەستپیس : دەست + پیس . دەستپیسهاوتای دزە . ئەو کابرایە ئەوەندە دەستپیسە لەهێلکەش ڕۆ دەکا !

دەسترازە : دەست + رازە . دایکی منداڵەکەی دەسترازەکەی بەسەر لایەکی دادا .

دەستەوەستان : دەست + ئە + وەستان . بێ دەسەڵاتکار لێ نەهاتوو. بۆ پیاوی دەستە وەستان چ گەرمێن و چ کوێستان .

دەستەڕاست : دەست + ئە + ڕاست . بە دەستە ڕاستێ دا بڕۆ ، دەگەیە بەر ماڵان . پاشا وەزیری دەستەڕاستی بانگ کرد .

دەستەچەپ : دەست + ئە + چەپ . بەلای دەستە چەپدابڕوانە بزانەچ دەبینی . وەزیری دەستە چەپکابرایەکی باش نەبوو ، هەر خەریک بوو چاڵێ بۆ خەڵکی هەڵکەنێ ...

دەستبەجێ : دەست + بە + جێ . دەستبەجێ هاوتای لە ناکاوەو کوتوپڕە ، هێندەی پێ نەچوو دەستبەجێ پێی زانی .

دەستبەخەنە : دەست + بە + خەنە . ژنەکە گوتی : ئێستێ خەنەم لەدەستم داوە ، شیشک نەبووتەوە ، کەوابوو چێشتەکەم پێ تێ ناکرێ . بۆتانووتلێدان لە کەسێکی بۆ ئیش و کار ڕانەپەڕێ دەکار ئەهێنرێ .

**دەست بەسەر** : دەست + بە + سەر . کابرایەکی نەهێڵن بە کەیفی خۆی بجووڵێتەوە و قسە بکا و دیلیش نەبێ ، دەست بە سەری پێ دەڵێن . لەمێژە ئەو کابرایە دەست بەسەرە و ناهێڵن پەل ببزێوێ ! " لەژێر چاوەدێری دا "

**دەستگیران** : دەست + گیران = دەس + گیران > دەزگیران هاوتای دەستگیران ، گراوی یا یارە .

**لەپی دەست** : لەپ + ئی + دەست . هاوتای لەپی دەست بەری دەستە . بە ئەمیر خانی برادۆست ، ئەمیرخانی لەپ زێڕینیشی پێ دەگوترێ . لەبەر ئەوەی لەپی دەستی لە زێڕی بووە .

**لەبەردەستان** : لە + بەر + دەستان . نانەکەی لەبەردەستان دا بنێ تا ببیندرێ و لەپێش چاوان بێ .

**دەست لەپاڵ ناوی لێکدراوی وەرگیراودا** (مرکب مشتق)

**دەست ئەستڕ**: دەست + ئەستڕ ( لە ئەستڕین) دەست ئەستڕەکەی بهێنە ، دەستت بسترە .

**دەست بڕ**: دەست + بڕ ( لەبڕین). ئەگەر ئەو کابرایە دەست بڕ نییە ، بۆ ئەوەندە شتی بە گران دەفرۆشێ ودەستی پیاوی لە بنەڕەتڕا دەبڕێ ؟!

**دەست بزێو**: دەست + بزێو . (لە بزاوتن) ئەوکەسەی دەستی زۆر دەجولێ و نارەحەتی بۆ دەوروبەری خۆی ساز دەکا .

" قامووسی زمانی کوردی ، ب دووەم ، زەبیحی "

**دەست پێ کەر**: دەست + پێ + کەر . (لەپێ کردن) بە کەسێکی دەگوترێ دەست پێ کەر،کە پێش چەند کەسی دی، کارێکی بکا .

**دەست چن** : دەست + چن . ( لە چنین) ئەو کڵاوە دەست چنە و بە دەستی چندراوە . یا : ئەو سێوانە دەست چنن و بە دەست هەڵبژێراون .

**دەست چێن** : دەست + چێن . ( لە چاندن) بە توو یا نەمام یا دارێکی دەست چێن دەکوترێن کە بە دەست چێندرابن یا چەقاندرابن .

**دەست دروو**: دەست + دروو ( لە دروون) . بە جل و بەرگێکی دەلێن دەست دروو کەهەر بە دەست دروابێ نەک بە هۆو ئامرازی

دی . رانک و چۆخەکەم دەستدرووە .

دەسترۆیو : دەست + رۆیو ( لە رۆیشتن) کەسێک کە دەستی بڕوا و دەسەلاتی هەبێ ، دەسترۆیوی پێ دەڵێن . پیاوی دەست رۆیو دەبێ ئاگای لەژێر دەستی بێ .

دەسترێژ : دەست + رێژ . ( لە رژتن یا رشتن) تەقاندنی چەند گوللەیەک بەجارێک لە لایەن چەند کەسێکەوە بەرەوشتێک " فەرهەنگی خاڵ ، ب ، دووەم "

دەستشکاو : دەست + شکاو ( لە شکان) دەستشکاو کەسێکە کە دەستی شکابێ . دەستی شکاوم / بۆخۆم لێرەنەبووم پێی رابگەم تۆش پێی رانەگەیشتووی !

دەستکەرەوە : دەست + کەرەوە . ( لەکردن) دەستکەرەوە کەسێکە کە ئازا و بوێر بێ و پشتنەکاتەوە ودوژمنی راونێ .

دەستکەوت :دەست + کەوت .( لە کەوتن) ئەو شتیانەی کە وەدەست دەکەون ، دەستکەوتیان پێ دەڵێن . دەستکەوتی ئەو تێکۆشانە و هەڵسوورانەم پتر لەوەی بوو کە چاوەروانی بووم .

دەستکێش : دەست + کێش ( لە کێشان) ئەوەندە تاریک بوو پێم پێ نەدەگوێزراوە ، دەستکێشم پێویستبوو . لە زستانیدا دەستکێشی لە دەستدەکەین ، تا دەستمان سەرمای نەبێ .

دەستگرە ≐ دەسگرە : دەست + گرە ( لە گرتن) بە دەسگرە مەنجەڵەکەم لەسەر ئاورگی داگرتتا چێشتەکە سارد بێتەوە .

دەستنێژ : دەست + نێژ ( لە ناژتن یا ناشتن ) نەمامێکە کە بەتایبەتی نێژرابێ . بریتییە لە یەکێک کە پیتگەیاندبێ و دات مەزراندبێ . " فەرهەنگی خاڵ ، ب ، دووەم ."

دەستەمۆ : دەست + ئاموو هاوتای دەستەمۆ ، رامە . ئەو کۆترە رەوەک و سڵ نییە و لەبەردەستان هەڵنایە .

دەسکەنە : دەست + کەنە ( لە کەندن) داسم پێ نەبوو ئەو گیایەی بدروومەوە ، دەسکەنەم کرد .

دەست لەپاڵ ناوە دووانەکان:

دەستاودەست: شتومەکێکی زۆرم کڕیبوو، بۆ ئەوەی مەودا ـ یەکی زۆری پێ بچێ و بیهێنمەوە ماڵێ، دەستا و دەست فرۆشتمەوە و قازانجێکی زۆرم لێکرد.

نێرگز بە بۆنەی چاوی مەستەوە،
ئەزاکی لە دەس دەستا و دەستەوە.

" پیرەمێرد، هاوار، ل ٢١٩ "

دەست بڵاوو چاو تێر: پێچەوانەی لەچەر و چروک و بەرچاو تەنگ و چاوبرسی، دەست بڵاوو چاوتێرە. کەسێک کە دەست بڵاوو چاو تێربێ، نان بدە و بە دڵ و دەروونە.

دەست رژد و بەرچاوتەنگ: ئی واهەن دەست بڵاوو نان بدەن و هێندێکیش بە پێچەوانە، دەست رژد و بەرچاوتەنگن و هەموو شتێکیان لەخەڵکی وەچاوە و شتیان هەر بۆ خۆیان دەوێ.

دەست رژد وچنۆک: هاوتای چروک و لەچەر، دەست رژدوچنۆکە

دەست رژد و چنۆک و گو نەکەر بوو،
بێ دۆست و قزە و نەزان وکەر بوو.

" مەم وزینی هەژار، ل ٥٢ "

دەست کورت وبێ ئەنوا: لەکۆمەڵێکی پاشکەوتوودا، پیاوی نەدار دەستکورت و بێ ئەنوا، لەپێش چاوان سووکە وهەوڵی بۆ نادرێ کە دەستی لەسەر کارێکی بەند کەن و بێ پەنا و پەسیو رایدەبوێرێ.

دەست و باسک: بەهۆی دەست و باسکی خۆم کارێ دەکەم و بژیوی خۆم وەدەست دەخەم، ئیدی چاوم لەوە نیە یەکێک خودا بەوێ رۆژی نەکا، چاکەی نانێکم پێ بکا! منەت لە دەست و باسکی خۆم.

دەست وبرد: ئی وا هەن زۆر لە کاران بە کاوەخۆو بەساوە ساون و کاریان زوو لەبەر دەستی رانابەرێ. ئی واش هەن بە پێچەوانە بە دەست وبردن و هێندەی بلێی یەک و دوو بەکار کۆتایی دەهێنن.

دەست و بردێ شنەبام بۆ زین کە
جێم لەگەڵ خۆت لە هەیف دابین کە
من و نینۆکم لەشکرمان گردە
لە کێچانمان هەر دەست و بردە
" بۆ کوردستان ، ل ، ١١١، ٣١٣ "
دەست و بردتکرد نەمزانی
ئەگەر بێیە خوار،یەکەم میوانی
" کەڵ و شێر، ل ، ٢٢٦ "

هەڵنیشتووە لەو گردە ، جیقنەی دەکا زۆر وردە ، ئێجگار بە دەست و بردە . واتە : هەڵۆ، " مەتەڵۆکەی کوردی،ل، ٣٢ "

دەست وبوو : کەسێک کە لە دەست وبوو کەوت ، بۆخۆی ناتوانێ بە پێداویستی یەکانی خۆی رابگا و ناتوانێ هەڵسووڕێ ودادە- کەوێ و گردەنشین دەبێ !

دەست وپل : منداڵ رمۆدەی ئەوەیە کە دەست لە هەموو شتێکی بدا . بەڵام چونکوو سەری لێ دەرناچێ هەر خۆی پیسوە دەغافڵێنێ و دەست و پلی پیس دەبێ ! دەبێ پێی بگوترێ کە دەست و پل لەشتی پیس،وەرنەدا .

دەست و پەنجە : هێندێک ژن هەن کەبۆ جوانی دەست و پەنجە - یان لە خەنە دەدەن . دەست و پەنجەی خڕوپڕ پەسندە .

دەست وپێ : ئەو کابرایەزۆر بێ دەسەڵات و دەست و پێ سپیلکەیە وکاری لە دەست راناپەڕێ . هێندێک ژن دەست و پێ یان لە خەنە دەدەن .

حەولیلکەی حەوا دەکا
بەدەست و پێ سەما دەکا
کولێرەی لەژنان چاکتردەکا
خواردنی پاشایان پەیدادەکا
"مێش هەنگوین "

دەست وپێوەند : ئەو کابرایە خزم و کەس و دەست وپێوەند - ێکی زۆری هەیە .

تۆخودا بڵێ بەو دوو لاوی دڵبەند

چەندیان هەیە دۆست ودەست وپێوەند
گوراندی لە پۆلی دەست و پێوەند
بۆ نایخەنە بەندو بیکەنە پەند ؟

" مەم وزین ، ل ، ٤١ ، ٧٨ "

دەست وتفەنگ : وەختێک دەست و تفەنگم دی ، زانیم ئەنگێوەی چاکە .

حەیف ئەی شاهەلۆ ، بۆبال وچەنگت
حەیف سەدحەیف بۆ دەست وتفەنگت !

" تاریک و روون ، هێمن "

دەست وچاو : دەست و چاوت خۆش بێ ، ئەو چیرۆکەت چاک نووسیوە ، وەبەر دلم کەوتووە . دەست و چاوت خۆش بێ بۆ چێشتی لێت ناوە . پیاو دەبێ دەست وچاوی پاک بێ .

دەست و داوێن :

نینە داوێن ودەستی خەلکی لادێ،پیس وئالودە
لەدەس ناچێ وەخت لێرە بەخۆڕایی بەبێهوودە

" تاریک وروون ، ل ، ٦٠ "

ژن دەبێ دەست و داوێن پاک بێ .

دەست ومست : پیاو دەبێ بە دەست و مست وچەنگ و نینۆک، و شان و باهۆی خۆی بەری بچێ و منەت لە خودای نەبێ لەکەس هەلنەگرێ و چاوبەرەژێری هیچ کەس نەبێ . بە

دەستەو ئەژنۆ :

بێ هێز و توان و دەستەو ئەژنۆ
هەر مەم ، مەمی بوو بەدادورۆ رۆ

" مەم و زین ، ل ، ٨١"

من بێ بەش نەبم لە کەرەمی تۆ
غەریب وفەقیرم و دەستەو ئەژنۆ

" بەیتی سعیدومیرسیف الدین بەگ،فتاحی قازی،ل ، ١٩ "

دەستە وخەنجەر :

موزەت نیزام و سەر عەسکەر
لە چاوان بەستان لەنگەر

لینگیان دامێ دەستەو خەنجەر

" گـۆرانـی "

دەستەوداوێن : دەستەو داوێنی بووم کە ئەو کارەی نەکا ، کەچی کردی !

یا نە بمکوژە یا دڵنیام کە
بەس دەستەوداوێن شێخ ومەلامکە

" گـۆرانـی "

دەستەودوعا :جاری وایە ، دایک و باب دەستیان بەرەوئاسمان هەڵدێنن و بۆ منداڵەکانیان لە خودای دەپاڕێنەوە . بەو کارانە دەڵێن : دەستە و دوعابوون .

هەی لای لایە ، رۆڵە لای لایە
نیشتمان بۆتودەستەو دوعایە

" بۆ کوردستان ، ل ، ٣١٢ "

دەستەونەزەر: جاری وا هەیە پیاو لەپێش کەسێک دا بە نیشانەی چوکیەتی رادەوەستێ ،دەستی لەسەر یەک بە زگیەوە دەنووسێنێ و وەک کۆتەڵ و لەشێکی بێ گیان متەقی لە خۆی دەبڕێ . بەو کارانە دەڵێن : دەستەو نەزەر راوەستان .

نازدار وجوان لەسەر تەلاران
دەستەو نەزەری بڵێن هەزاران

" مەم و زین، ل ،٨٤"

دەستەویەخە : ئەو دوو کابرایە لەگەڵ یەک بەشەڕ هاتن . دەستیان بە بەرۆکی یەکتری یەوە گرت ودەستەو یەخەی یەکتری بوون و ئەوەندەی توانیان یەکتریان تێک هەڵشێلا . پاشان خەڵک گەیشتنێ و لێکیان کردنەوە و ئاشتیان کردنەوە .

دەست ، لەگەڵ زاراوەدا "

ئەمدەست ئەو دەست پێ کردن : ئەو کابرایە شتێکی لێ وەرگرتووم نامداتەوە.هەر ئەو ڕۆو سبەینێ و ئەم دەست ئەو دەستم پێ دەکا .

بە دەست وپێ لە شتێک دان : بە دەست و پێ لەدارەکەم دا تا میوەکەی بوەرێ .

بە دەست وردکردن : بە دەست سندە گڵەکەم هەڵ وەراند و وردم کرد .

بە دەست وەشاندن : بە دەست وەشاندن واتە بەدەست لێ دان.

بە دەست هلۆڵ کردن : دارەکەم بە درێشە و بە دەست ئەوەندە هەڵ کەند کە وەک ئیستیکانی هلۆڵم کرد .

بە دەستەوە گرتنی شتێک : گۆچانەکەم بەدەستەوە گرت و بە رێیەدا رۆیشتم. بەدەستەوەگرتنی هێزی یاسایی ئاگاداری دەوێ .

بەدەستەوەمان : لەسەر ئەو هەموو دراوەی کەبە دەستمەوە بوو هەر دوو تمەنم پێ ماوە. دراو لەسەر یەک دانان و وەخڕ کردن گرینگ نیە ، گرینگ ئەوەیە بە دەستمانەوە بمێنێ .

بەدەست هەڵپەرتاوتن : بەدەست لک وپۆپی دار لێ کردنەوە پێی دەڵێن هەڵپەرتاوتن .

بەدەست هەڵدانەوە: کاتێک پیواز یا هەڵووچەی لەسەر یەک وەخڕ کەین و کۆبکەینەوە بە دەست هەڵماندا ونەوە .

بەدەستەوەدان : شەڕکەری چاک کەسێکە خۆ بەدەستەوە نەدا .

بەزەبری دەست شتێک دەرهێنان : دارەکە لە هەرد دەرنەدەهات بەزەبری دەست لە ڕەگ وریشەم هێنا دەرێ .

بێ دەست وپێ بوون : کاتێک کار لە دەست کابرایەکی رانەپەڕێ و هەر بە لادا بخرێ دەڵێن بێ دەست و پێ یە . بێ دەست و پێ بوون ، واتە دەست و پێ سپیلکە بوون .

خۆبەدەستەوەدان : کابرای شێت لەپێش دا خۆی رادەپسکاند و بۆ لای کەس نەدەچوو ، بەڵام لە دوایی دا خۆی بەدەستەوەدا .

دوورەدەست بوون : ئەو کابرایە ئەوەندە دوورە دەستە

دەستمپێی راناگا و دەنگم پێی راناگا .

**دەستاو دەست** :پێ کردن: وەختێک دەچم بزانم شتەکەی بۆ چاک کردووم یا نا ، نە شتەکەم دەداتەوەنە بۆ م چاک دەکاتەوە هەر دەستا و دەستم پێ دەکا و دڵنیاشم ناکا .

**دەستبادان** : دەستبادان واتە دەستراپێچان و فێڵ لێ کردن و کڵاو لەسەر نان و هەڵخەڵەتاندن .

**دەستبردن بو شتیک** : دەستم برد بۆ پارووکەی ولە زارمنا و جووم. دەستم برد بو پێنووسەکەی و دەستم کرد بە نووسین .

**دەستبەردان** : کاتیک جولللانەی رابژێنی دەستیشی لێ بەر دەی هەر بۆخۆی رادەژێ . وەختێک پیاو دەستی لە تەماحێ بەردا زۆر کاری بۆ بە ئەنجام دەگا .

**دەستبەرەوشتێک کوتان** : شەوێکی تاریک وتنۆک ، هەر بە کوترە کوتر دەرۆیشتم.دەستم بەرەوتفەنگەکەم کوتا لە جێیی خۆی نەمابوو .

**دەستبەستران** : کارم پێ ناکرێ چونکە پارەم بە دەستەوە نیە، دەستم بەستراوە . براکەم ئەوی پارەی هەمبوو لێی پووچ کردمەوە و دەستی لەتەختەی بەستم، ئێستێش هیچم پێ ناکرێ .

**دەستبەسەرداگرتن** : کاتێک کە بابم مرد برا گەورەکەم دەستی بەسەر ماڵ و سامان و داهات ومیراتی بابم داگرت وزۆر داری لە میرات گران کرد. بەڵام بۆخۆشی خێری لێ نەدی .

**دەستبەسەرداهێنان** : تووکی سەرم ئاڵۆز بوو دەستێکم بە سەرمدا هێنا و ئاڵۆزی یەکەم رەها کرد .

**دەستبە شتێک داهێنان** : دەستم بە دارەکەی داهێنا ،کونجر کونجر بوو .

**دەستبەند لە دەستکردن** : دەستبەندیان لە دەست دیلەکەی کردبوو و بەستبوویان.تا هەڵنەیە .

**دەستپێچانەوە**: دەروەستی دێم و پشتی لێ ناکەمەوە و دەستی لێ ناپێچمەوە. برینم لە دەستی هاتووە وپێچاومەتەوە.

**دەستپێداگرتن** : دەستپێ داگرتن واتە دەست بە سەر شتێک داگرتن . دەستپێ داگرتن بە ماڵی خەڵک دا ، چاک نیە .

**دەست پێ دا هێنان** : کاتێک شتێک ئالۆز بێ دەستی پێ دا دەهێنین تا لووس و لەبار بێ .

**دەست پێ راداشتن** بەشتێک : زۆرم سەرما بوو دەستم بە ئاورەکەی راداشت تا گەرمی ببێتەوە .

**دەست پێ راگرتن** : دەست پێ راگرتن واتە دەست پێ راداشتن

**دەست پێ راگەیشتن** : پشیلە دەستی بەدووگی رانەدەگەیشت دەیگوت سو یرە و ناخورێ! کاتێک دەستمان بەشتێکی رانەگا هەوڵ دەدەین دەستمان بیگاتێ .

**دەست پێ کردن** : تازە دەستم کردبوو بەنووسینی ئەو کتێبەی کەکۆسپێکم بۆ هاتەپێش ئیتر دەستم لێ هەڵگرت.دەست پێ کردن بەکارێک پێچەوانەی کۆتایی هێنانە . هەموو کارێک هەر دەست پێ کردنەکەی گرینگە ،ئیتر هەر بۆ پێش دەڕوا .

**دەست پێک گرتن** : دەست پێک گرتن واتە دەست بە یەک گرتن . کاتێک دوو کەس دەستیان بە یەک بگرن هێزێکی نهێنی گەورە پێک دێ .

**دەست پێکەوەنان** : دەست پێکەوەنان واتە دەست پێکەوە گرتن .

**دەست پێ لێ هەڵگرتن** : دو زینەوەی ئەوکارە بووبە هۆی ئەوە کە دەستی پێ لە کارەکەی پێشوو هەڵ بگرم .

**دەست پێوەگرتن** : دەست بە نانەکەیەوە بگرە تاکوو زوو تەواو نەبێ و بەرگەی ماوەیەکی بگرێ .

**دەست پێوەنان** : دەستم بە دارەکەیەوەنا ، هلبۆڵ بوو ،بەری هێزی دەستمی نەگرت ،بەلادا کەوت !

**دەست پێ هەڵگرتن** : جاران جەمان گۆشتم زۆر دەخوارد ، دوکتور پارێزی داومێ و دەستی پێ لە گۆشتی هەڵگرتووم .

**دەست تێدابوون** : کاتێک کە دزی دەکرێ پۆلیس ئەو کەسانەی کە شکیان لێ یەتی کە دەستیان لەو کارەی دایە دەگرێ ولێیان وەپرس و جوو دەکەوێ .

**دەست تێک کوتان** : کاتێک نارێکێک پێک دێ خەڵک هەر دەستیان تێک دەکوتن و نازانن چ دەکەن .

دەستتێکەڵ کردن : واتە تێکەڵاوی ژن و پیاو .

دەستتێک نان : لە رەشبەڵەک دا ژن وپیاو دەستتێک دەگرن و هەڵدەپەڕن ودەست تێک دەنێن .

دەستتێک هاڵان : شارەزای ئەوکارە نین و هەر دەستیان تێک دەهاڵێ .

دەستتێوەردان لە شتێک : دەستتێوەردان واتە هەڵ گێر وەرگێرکردنی شتێک . ئەوەندەم دەستم لە ئاردەکەی وەردا کە دەنکە گەنمەکەم تێدا دیتەوە .

دەستتێ وەرێ نان : دەستم لە قەدی دارەکەی وەرێ نا. هەر دووک دەستم نەدەگەیشتنەوە یەک .

دەستچوون : لە زستانێدا پیاو دەستی لەبەرسەرما یە دەچێ و وەختە لێ بێتەوە !

دەستخشاندن : دەست خشاندن واتە دەستکوتان یا دەست لێدان لە شتێک . دەستم زۆر لە دارەکەی خشاند،لووس نەبوو بەڵکوو کونجر کونجر بوو .

دەستپێ دادان : دەستت بۆ بە قورئانی دادەدەم کە ئەو شتەم هەڵ نەگرتووە .ئەسپەکە ئەوەندە ماندوو ببوو، کەگەیشتە بەردەلانەکەی دەستی دادان و بەلادا کەوت .

دەستداگرتن : دەستداگرتن واتە پەستاوتنی شتێک بە دەست . دەستت لەوکشمیشەی داگرە ئەوەندەی بە دەستتەوە هات ، هەڵێ گرە .

دەستدامالین : وەختێک بە دەست لە سەرەوە بەرەو خوارێ دەستی تر، دادەماڵین پێی دەڵێن دەستدامالین .

دەستدان : بۆمن دەستنادا ئەو هەموو شتەی بکرم .دەستم دا جلەوی ئەسپی و پێم پێوە نا . دەستت بدە بەمن تا بتپەڕێنمەوە . دەستت بدە بە من تا شەقەی سەوداما ن بێ . قەت دەستی دۆستایەتی نادەم بە دوژمن . چەندجار دەستی دۆستایەتیم داوەتەوە.بەلام وەدوژمنایەتی گەڕاوە .

دەستراپسکاندن : دەستراپسکاندن واتە دەست بۆ لایەک بردن. ئەگەر دەستم رانەپسکاندبایە سەگەکە دەستی دەکرۆشتم .

دەستدرێژی : تەجاوەز کردن . ژێرپێ کردنی ماف .

دەست راداشتن : دەست راداشتن واتە دەست راگرتن بۆ لای شتێک. دەستم بە ئاورەکەی راداشت تا گەرم بێتەوە . لــە دوور را دەستم بۆ راداشت تا بمناسێتەوە و بۆ لای من بێ .

دەست راگرتن : ئەوەندە دایکم خۆش دەوێ ،دەستم راگرتووە دایکم بەسەری دا بڕوا . قامکی دەستم ماوەیەکە راگیراوە و زۆر دێشێ! دەستت لەسەر رادەگرم هیچ شتێکی ناخۆم تا ئەتۆ دێی .

دەست راگەیشتن : ئە ومندالە دەست بزێوە ، دەستی بەهەر شتێک رابگا خرابی دەکا و نایهێلێ !

دەست راهێشتن : دەست راهێشتن واتە دەست راوەشاندن.

دەست رۆیشتن : پیاوی دەست رۆیو دەستی دەروا . پیــاوی زۆردار بێتوو دەستی رۆیشتبا زۆری لەهەموو کەس دەکرد .

دەست رەپێش خستن : چاک وایە پیاو لەکاری چاک دادەست رەپێش خا و چاوی لە ئەوەی نەبێ کەسانی تر شتێک بکەن ئەوجار ئەویش کارێکی بکا . دەست رەپێش خستن واتە یەکەم کەس بوون ، لە بەرێوەبردنی کارێک .

دەست رەگەڵ گرتن : چووم لە کۆڕی هەڵپەڕین ودەستم رەگەڵ هاوالان گرت و تا توانیم هەڵپەڕیم .

دەست رێژکردن لە کەسێک یا لە شتێک : دەست رێژ کــردن واتە تەقەکردن بە تفەنگ لە پەستاویەک لەدوای یەک . دەســت رێژێکم لە دوژمن کرد بەلام وەبەر نەهات و بە زەق وزیندوویی هەلات .

دەستشکان : دەستشکان واتە دەست شکاندن . دەستی شکاو هەلدەبەسترێ تا جێی خوێ بگرێتەوە . دەستێک کە شکا ،درەنــگ جێی خوێ دەگرێتەوە .

دەستشل بوونەوە لەکارێک : منداڵەکەم چاک لەدەرسەکــەی نەگەیشتبوو ، خەریک بووم تێم دەگەیاند ، بەلام زانیم کــە نەخۆشەئیتر دەستم لەکاری شل بووە و وازم لێ هێنا تاکاتی چاک بوونەوە . تا تەندوور گەرمە نابێ دەستمان لە نـــان

پێوەدان شل بێتەوە و دەبێ بە دەرفەتی بزانین .

دەست شووشتن : دوای خواردنی خواردەمەنی دەبێ دەستمان بشۆ ین . تا ئێستێ هەر چوارجار دەرمانەکەم خواردووە.ئیدی چ جارێ‌دیم نەخواردووە ، ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ .

دەست‌کردن بە شتێک : دەست‌کردن بە شتێک واتە ، دەست پێ کردن بە شتێک ، وەختێک دەستی کرد بە قسان، نۆبەی کەس نادا ! هەر دەستکا بەشەڕێ، کەس ناتوانێ بەرەنگاری بێ و دەروەستی بێ ، نەبەزی وا هەر نیە .

دەست‌کردنەوە : دەست‌کردنەوە واتە پشت نەکردنەوە .کاتێک لە دوژمنان رادەسێ پشت لە چل سواران ناکاتەوە وخەنیمی سەد کەسیە .

دەست‌کوتان لەشتێک : کاتێک لەدوای شتێک بگەڕێین و چاویشمان پێی نەکەوێ دەست دەخشێنین تاکوو وەبەر دەستمان دەکەوێ و بەوکارە دەست‌کوتان دەڵێین .

دەست‌کوشین : کاتێک دەستم لەنێو دەستی نا ،کەمێکم کوشی و خۆشەویستایەتی خۆم دەربڕی . هەر وەک جل وبەرگ دەشۆ ین و دەیان کوشین تا ئاویان لێ بێ ، ئەوجۆرەش دەست دەکوشین .

دەست‌کەوتن : لەمێژە دەستێکی رانک و چۆخە رائەسپاردوومێ کە بۆی بکرِم،بەڵام تا ئێستێ دەستم نەکەوتووە . هەر شتێکی دەست نەکەوتوو بەقیمەتە هەر کە دەست‌کەوت هەرزان دەبێ .

دەست‌کێشان : چاوساغی کوێران دەستی کوێران دەکێشێ تا رێی ببیننەوە و بە هەڵە نەچن . وەختێک کابرا هاتە ژووریێ ویستی لە خوار کوڕەکە دابنیشێ بەڵام دەستم کێشا و بردمە سەرێ .

دەست‌کێشانەوە : ئەوەندەم لە دوژمن دا و کوتام تاماندوو بوو ئینجا دەستم لێ کێشاوە ،

دەست‌گرتن : ئەو کابرایە دەستی داماوان زۆر دەگرێ.برۆ دەستی زەماوەندێ بگرە و چەند گەڕێک هەڵپەڕە .

دەست‌گرتنە ژێربالی یەکێک : دەست‌گرتنە ژێربالی یەکێک واتە بەفریا گەیشتن وشان هێنانە ژێرباری قورسی ژیان بۆ

یەکێک .

دەستگرتنەوە : دەستم گرتۆتەوە چم بۆ تێداوێی تێ باوێ، زۆر کەسی وا هەن پێش ئەوەی کارێکی بکەن دەستیان بەژنێکی دەگرنەوە ، ئەگەر چاکی هێنا دەیکەن دەنا نایکەن .

دەستگەیاندنە کەسێک یا شتێک : شیرینی یەکە نەماوە بێو نەبێ کورەکە دەستی گەیاندۆ تێ و هەڵیگرتووە . دەست گەیاندنە یەکێک واتە لێدانی وی . بچی لە کۆشی دایکیشتەوە هێشتا دەستێکت هەر دەگەیەنمێ !

دەستگێران: دەستگێران واتە دەست کوتان و لە شتێک گەران بۆ دیتنەوە . دز هاتۆ تە ئەوماڵەی دەستێکی پێدا گێراوە .ئەوی هەیانبووە بە خڕی دزیویەتی ! دەستم لەدراوەکەی گێرا چم وەبەردەستی نەهات .

دەستگێرانەوە : پیاو دەبێ لەکردنی کاری خراپ دەست بگێرێتەوە تا رزگار بێ . دەستت نەگێرێوە پێت دەگێرنەوە .

دەستگیرکردن لە شتێک : ئەوانەی کە بە کێوێک یادارێک هەڵدەچن بێتوو دەست لە شتێک گیر نەکەن بەر دەبنەوە .

دەستلەبارنەبوون : پێچەوانەی دەستلەبار بوون ، دەست نالەبار بوونە . دەستی ئەو کابرایە بۆ ئەنگاوتن زۆر لەبارە .

دەستلەپاڵ یەک نان : دەستلەپاڵ یەک نان واتە دەست لەنێو دەستی یەک نان .

دەستلەرزین : پیاوی دەستلەرزۆک دەستی دەلەرزێ. هێندێک کەس کە دراوی زۆر خەرج دەکەن دەستیان دەلەرزێ .

دەستلەرەش وسپی دان : کەسێک کە تەوەزەل بێ و کاری لەدەستنەیە ، دەڵێن : ئەو کابرایە سەری بەنێکی پێ ــــە دوولا ناکرێتەوە یا دەستلە رەش و سپی نادا .

دەستلە شتێک بەردان : دەست لەشتێک بەردان واتەبەرەڵلا کردنی شتێک .

هەی بەردە بەردە بەردە
دەستلە بەرۆکم بەردە

" گۆرانی"

دەست لە شتێکەوەچوون: دەستم برد ەنێو دیزەکەی کەمیوەکەی دەرێنم. بەلاّم دەستم لە دیزەکەوە چوو بە گیرە گیر دەرم هێنا.

دەست لە شتێک ساردبوونەوە: دەست لە شتێک ساردبوونەوە، واتە دەست لە شتێک شل بوونەوە. ئەو کارەم وەها دەست پێ کردبوو کە یەک بین تا تەواو دەبێ دەستی لێ هەڵنەگرم بەلاّم ورەم بێ هێز بوو و دەستم لێی سارد بووە ..

دەست لە شتێک نان: دەستم لە تینتینووکەی نا، هێندەی نەمابوو بیخنکێنم. دەستم لە بنانگوێچکەی ناو تێم هەڵکردە بەیتی خەج و سیامەند.

دەست لە قرقرۆچکەی کەسێک نان: دەست لە قرقرۆچکەی کەسێک نان واتە دەست لە تینتینوکەی کەسێک نان. دەستم لە قرقرۆچکەی دوژمن ناوهێندەی نەمابووهەستی لێ ببرم!

دەست لە گۆچوون: دەستم لەگۆچووە واتەدەستم لەسەرما ناهێزی نەماوە (فەرهەنگی خال، ج ٣) زۆرجار لەزستانێ دا دەستم لەگۆ دەچێ ووەختە لێ پەرێ.

دەست لە مل کردن. دەست لە ملان کردن واتە دەست لە ملان بوون ەدەستە ملان. کاتێک لەگەلّ هاوالّەکەم ئاشت بوومەوە دەستم لە ملی کرد وماچم کرد و بریارمان دا کە ئیدی لێک نەتۆرێین.

دەست لە مل دان بۆ یەکێک: بێتوو لێم پرسن کە کێهەتان راست دەلێین و کامەمان چەوت، دەستت بۆ لە ملی دەدەم کە ئەتۆ راست دەلێی و کابراکە چەوت دەلێ. وەبالت بە ئەستۆی من مافی ئەو کابرایەی پێوە نیە و ئی تۆیە.

دەست رێ خستن: دەست رێ خستن لە شتێک واتە دەست بەسەر شتێک دا هێنان. کاتێک دەست لە شووشە بخەین لووسە. تا دەست لە شتێکی نەخەین نازانین لووسە یا گرنی گرنی یە.

دەست لێدان: هاوتای دەست لێدان، دەست رێ خستن و دەست رێ خشاندنە.

ناوێرم بیکوشم، بیمژم، لیمۆکەی کالە
دەستیان لێ مەدەن روویان بە خالە

"گـــۆرانـــی "

ڕۆڵە دەستت لە ئاورەکەی مەدە ، دەستت دەسووتێ .

دەستلێ دەرهێنان: کاتێک دەستم لە چۆخەکەی دەرهێنا لێم حاڵی بوو کە پڕ بە بەدەنمە و نە تەنگە و نە فش.ئەو کابرایە دەستی لە قۆ لێ کراسی خۆی هێناوەتە دەرێ. واتە خۆی بە نەدار و بێ کەس دەزانێ ، کەچی وانیە .

دەستلێ ڕاداشتن : دەستلێ ڕاداشتن نیشانەیە بۆ بانگ هێشتنی یەکێک . دەستم لێ ڕاداشت کە بێتە لام بەڵام نەیزانـــی لەگەڵ ویمە .

دەستلێ ڕاوەشاندن : دەستلێ ڕاوەشاندن لە یەکێک واتە دەست تەکان دان لە یەکێک . دەستم لە دوور ڕالێ ڕاوەشانـد، کە بڕوا بۆ لای ماڵێ.ئەویش ئەو کارەی کرد .

دەستلێک دان : دەستلێک دان واتە دەست لە یەک دان . دەستێکم لە دەستەکەی دیکە دا کە تەقەی بێ . دەست لێـــک مەدە،تا دەنگی نەیە .

دەستلێ کوتان : تاریک بوو ، شەمچەکەم لەپێش چاوی نەبوو دەستم لێ کوتا تا بیبینمەوە و چراکە هەڵکرد ئەوەندە تاریک بوو چاو چاوی نەدەدی بە دەستکوتان چوومە پێشەوە .

دەستلێک هەڵگرتن : دەستلێک هەڵگرتن واتە دەسـت لـە یەکتر هەڵگرتن . کابرای خاوەن ماڵ دزەکەی گرت . دەستیـان کرد بە لێک دان . پاش ماوەیەکی کە ماندوو ببوون دەستیـان لێک هەڵگرت و هەرکەسە بە لایەکی دا ڕۆیشت .

دەستلێ وەشاندن : جندووکان دەستیان لێ وەشاندووە بۆیە ماخولیا بووە .

دەستلێ هەڵگرتن : دەستلێ هەڵگرتن واتە دەست لە کۆڵ کردنەوە لە یەکێک ، لێ گەڕان لە یەکێک . بێتوو هەرجەزرە ـ بەم دەی و دەستم لێ هەڵ نەگری لێدەدەم دەڕۆم و بەجێـــت دێڵم .

دەست و لاق شوشتن : کاتێک دەسنوێژ هەڵدەگرین دەســـت و لاقمان دەشوین . دەست و لاق شوشتن بۆ دەسنویژ هەڵگـرتنـــێ

کارێکی بەجێ یە .

دەست وەبەرخۆ کەوتنەوە : دەست وەبەرخۆ کەوتنەوە واتە کەوتنەوە سەرخۆ. ئەوەندەم کار هەیە هێشتا دەرفەتم وەدەست نەکەوتووە و دەستم وەبەرخۆ نەکەوتووەتەوە .

دەست وەبەر دەستی کەسێک هێنان : دایکم ئەوەندە خۆش دەوێ تەواوی داهات و مالّم بکاتە هێلکێک و بەدیواری دادا ، هێشتا دەستی وەبەر دەستی ناهێنم. دەست وەبەر دەستی کەسێک هێنان واتە پەکی کاری کەسێک خستن .

دەست وەپێش خستن : دەست وەپێش خستن واتە لەپێش کەسێکی دیدا کارێک کردن . بۆ کاری چاکە دەست وەپێش خستن باشە .بۆ وێنە سلاّو وەپێش خستن زۆر باشە .

دەست وەرگەڕان :دەست وەرگەڕان واتە دەست لەجێ چوون . کاتێک دەستمان وەربگەرێ دەچینە لای دوکتور وئەویش دەستمان دەهێنێتەوە سەرجێی خۆی .

دەستێوەرهێنان : دارەکە ئەوەندە ئەستوور بوو کاتێک دەستم تێ وەرهێنا ،بە زەحمەت تێی وەرسوڕا .

دەست وەشاندن لە کەسێک : دەست وەشاندن لە کەسێک واتە دەست لێ وەشاندن لە کەسێک . دەست وەشاندن هاوتای دەست لێ دانە .

دەست وەلانان : دەست وەلانان لە کارێک واتە کاری پێ نەدان. دەستم لەو کارەی وەلا ناوە واتە وازم لەو کارەی هێناوە .

دەست وەیەک نان : دەست وەیەک نان واتەدەست بەیەکەوەنان.

دەست هەلّتەکاندن لەکەسێک یا شتێک : دەست هەلّتەکاندن لەکەسێک واتە ئاگادارکردنی کەسێک بەدەست .

بەدەست هەلّخلاندنی شتێک : بەدەست گوێزەکانم هەلّخلاند.

دەست هەلّکردن : دەست هەلّ کردن واتەقۆلّ هەلّمالّین .

ژنەکە دەستی هەلّ کرد و دەستی کرد بە شیو .

دەست هەلّگرتن : دەست هەلّگرتن واتە واز لە کارێک هێنان و وەلاخستنی کارێک . دەست هەلّگرە لەو چەقە چەقە . با کەمێک بەخۆشی راببوێرین .

**دەست‌هێنان بۆ شتێک** : دەست‌هێنان بۆ شتێک واتە دەست بۆ لای شتێک درێژکردن .

**دەستی دەستی پێکردن** : دەستی دەستی پێکردن واتە ئەو دەست ئەم دەست پێکردن تا کات بەفیرۆیی بەسەر بچێ .

**کار لەدەست راپەڕین** : کار لەدەست راپەڕین واتە کار لە دەست‌هاتن . ئەو کابرایە ئەوەندە تەوەزەلە هەر کاری لە دەست راناپەڕێ و زۆر بە ساوە ساویو خێرا نیە .

**کار لەدەست‌هاتن** : کار لەدەست‌هاتن واتەمشوور هەبوون، بۆ بەرێوەبردنی کارێک . ئەو کابرایە کاری لە دەستنایە.

**کولەدەست‌کردن**: زستانان ئەوەندە ساردە کە کولەدەستمان دەکەین تا دەستمان گەرمی بێتەوە .

**لەبن دەست‌بوون** : شووشەکە لەبن دەستتەنەک لە سەر دەستت. بن دەست‌بوون و لەژێر دەست‌بوون .

**لەبەر دەستان بوون** : لەبەر دەستان بوون واتە دیاری بوون . هەر شتێک لەبەر دەستان بێ ئاشکرایە،بۆئەوەی نابێ لێی بگەڕێین .

**لەبەر دەست‌بوون** : هاوتای لەبەر دەست‌بوون، لە بەر دەستان بوونە . هەر ئێستێ لەبەر دەستم بوو،نازانم چم لێکرد و لێم ون بووە .

**لەدەست‌چوون** : لەدەست‌چوون واتە لەدەست‌دان ومردنە . دایک و باب تا لەدەست نەچن ، پیاو قەدریان نازانێ .

**لەدەست‌دان** : لەدەست‌دان واتە لەدەست چوون. خودا ــ لێخۆشبووی دایکم کە ئێستێ لەدەستم داوە ، لەماوەی ژیانی خۆیدا باڵی بەسەرم کێشابوو،تا ئەو مابوو لە هیچم کەمنەبوو! بەڵام لەدەست‌دانی ئەو کەلێنێکی خستە ژیانی بنەماڵەیی .

**لەدەست دەرچوون**: تفەنگەکەم پڕ کردبوو ودامنابوونەمزانی قامکێکم بە پەلەپیتکەی داهێنا و لەدەستم دەرچوو .

**لەدەست‌کردن** : زستانان دەستکێشی لە دەستمان دەکەین تا دەستمان سەرمای نەبێ .

**لەدەست و برووکەوتن** : لەدەست وبوو کەوتن واتە پیرو

زورهان بوون .پیاو کە لەدەستو بوو کەوتە گردەنشین دەبێ.
لەسەر دەستان بوون : ئەو ژنە مانگ ورۆژی خۆیەتی و لە سەر دەستانە و هێندەی نەماوە بزێ .
لەسەر دەستان هەلگرتن : قارەمانەکەیان لەسەر دەستان هەلگرتبوو و بەنێو حەشیمەتدا دەیانگێڕا .
لەسەر دەستدانانی شتێک : سێوەکەم لەسەر دەست دانا و پێم نیشان دا .
وەدەستخستن : وەدەستخستنی شتێک واتە وەدەستکەوتن . بێتوو کتێبەکەم وەدەستخاتەوە ، مزگێنی دەدەمێ .
وەدەستکەوتن : لە پاش خوێندنەوەی ئەو کتێبەکەلکێکی زۆرم وەدەستکەوتووە .
وەدەستگرتن : شارەدار بەهێزێکی وەدەستگرتووی تازەوە هاتووەتە سەرکار .
ئەوەندەم شتی قورس و گران بەدەستهەلگرتبوو فل ببووم .
پر بە لۆچی دەستم خۆڵم هەلگرت .
پێستی دەستم هەلاّزرابوو ، دەستێکم پێداهێنا چاک بووە .
شتێکی ئاوام نووسیبوو دەستبە دەستدەگەڕا .
ئەوەندە دەستی دەلەرزی کۆترەکەی لەدەستهەلّفڕی .
ئەبووعەلی سینا لە حەوتساڵی دا ئەوەندە زیر و وریا و خوێندەوار بوو کە دەستی لەهەموو خوێندەوارەکانی هاوچەرخی خۆی ،ئەستاند .
کاتێک هەواڵی مردنی بابیان پێدا،بە هەردووک دەستان بەسەر سەری خۆی دادا .
ئەی داد لەدەستپیاوی خراپ ، هەرچی لەگەڵی بکەی، پێ نازانێ !
یەکێک لە براکانم زۆر هەلسووڕا ووبەکارە.بەلاّم ئەوی دیکەیان ئەوەندە تەوەزەلە ، دەستلە ڕەش و سپی نادا . حازر خۆری بەر سێبەرە .
ئەوەندەم کاربەدەستەوەیە سەری خۆم پێ ناخورێ .
دوژمن ئەوەندە گیان سەختە ، دوو ڕۆژە ئاویلکان دەدا ،

بەڵام گیان بەدەستەوە نادا .

دەستم ڕاگرتووە-دایکم بەسەریدا بڕوا لەبەرئەوەی کە زۆر شەوو شەونخوونی لەسەرەمن کێشاوە .

عەبدولعەزیزە کوێری داسنی لەسەر ئەوەش را کە کۆستی کەوتبووە بەو کەسانەی کە بانگی هێشتبوونە سەر شایی سێ کوڕانی دەیگوت : دەستی گۆ وندو زەماوەندێ بەر مەدەن، بەڵا دڵی کیژ و کوڕانم لێ نەمێنێ !

زۆرم کار بەدەستەوەیە .

منداڵەکانت بەدەستی خۆت کفن کردبێ ، درۆ یە ناکەم .

من ڕاست دەڵێم ، هاتوو درۆ م لەسەر سوور ،کراوە، دەستم ببڕە .

دەست لەسەر سینگ ئامادەی هەر کارێکم بۆ تۆ .

دەشتێکی پان و بەرین و بێ گەندوکڵۆیە، وەک بەری دەست .

لەوەتی دەستی ڕاست و چەپی خۆم ناسیوە هەر لە کوێرەوەری دابووم !

تا دەستی لەسەر دانێی، پیاوی چاکە .

هێندەی (وست لە چاوێ دەی ،کارەکەم کۆتایی پێ هێنا .

ئەو کابرایە دەستی دزیەتی هەیە .

دەستی خۆت بدە بە من تا شەقەی سەودامان بێ . خێری لێ ببینی .

کە باوێشکم دێ دەست بە زارمەوە دەگرم .

بەری دەستم دەخورێ، پوولێ دێتێ .

ڕۆژ بەسەر چوو ، شەو بەسەر دەستان داهات .

ئەوەندە کابرایەکی فێڵەبازە دەستی پیاوی لە بنەڕەت ڕا دەبڕی .

مەچەکی دەستی وەک بابۆڵەی وایە .

لەو کارەدا ئەوەندە بەناوبانگە دەستی هەموو کەسێکی لە پشتەوە بەستووە .

بەدەستی خۆم شتەکەم ونکردووە و ناچمەوە سەری .

کاتێک چم لەدەست نایە ، دەستێکم دەکەوێتە ئەولاو دەستێکی

دیکەم دەکەوێتە ئەملا .
سوێندت بۆ دەخۆم دەستم لەهیچ شتێکی نەداوە .
بەدەستی خۆم قەپووچکێکم لە ماستەکەی دا .
بەدەستی خۆم قدیلکەم داو وەپێکەنینم خست .
بەدەستی خۆم پارەیەکم بەدەست قەرز داوەتێ .
دەڵێی بازی سەردەستانە و لە کۆمەڵ دا ئەوەندە دیاریپە
ئەوەندە لە کاران بە شاوە ساوە ، هەر دەڵێی دەستی پێوە نیە .
ئەوەندە دایکم ئەمەگی لەسەر منە ، ئەگەر ئەو دەستەم ماندوو بێ بەو دەستەمی هەڵدەگرم .
لەو قسانەی کە پێم کوتی بە ئەویشم کوت ، نە زیاتر نە کەمتر شاو بێنە و دەستان بشۆ .
دەستێک بە دەموچاوتدا بهێنە،بلا خاوێن ببنەوە .
دەستێک بەسەرو سەکوتتدا بهێنە .
دەبێ بۆ جەمێ بێیە ماڵی ئێمە ، نانی ناخۆم دەستت لەسەر رادەگرم .
کەسێک دزی کرد،دەبێ دەستی ببەڕێنن .
گەر خودا دەستم بدا ،ئەوساڵ خانووەکەی دەستپێدەکەم ..
ێتوو هەردووک دەستمان بەولاولای دا راگرین و بە دەوری خۆماندا بسوورێینەوە . دەبێتە یاری مندالانە . کەپێی دەڵێن ساوەگێژە.
دەست لەو مندالەی هەلگرە،بلا بای باڵی خۆی بدا .
ئەمن نەبووم دەستم بوو ( یاری مندالانە )
لەوەتی تەشوێکەی لێ ئەستاندووم هیچم پێ ناکرێ ودەستی لەتەختە بەستووم !
گوتبووی بچمە لای،کەچی چووم و لەوێ نەبوو. ئیتر دەست لەپێ درێژتر گەڕامەوە و هیچم پێ نەگەیشت .
دەستی دوژمن لێکی کردین . دوابڕاو بێ !
کوتکەکەی زۆر لە دەستان خۆشە .

دەست لەگەڵ هەڕەشە و نەفرین وجنێودا :

بچی لە باوەشی بابیشتەوە دەستێکت هەر دەگەیەنمێ .

بچی پەڕپەڕۆچکەی ئاسمان دەستێکت هەر دەگەیەنمێ .

بۆچی بەدەستی خۆت ئاوری شەڕەکەت هەڵایساند ؟ دەک بـــۆ خۆشت بە ئاورەکەی بسووتێی .

مەگەر هەر دەستم پێت رانەگا ، دەنا دەستت دەشکێنم .

هەی دەستت بە برین چێ .

بەدەستی خۆم چم کرد لە خۆم !

ئەو کابرایە دەستی کەریەتێی هەیە .

ئەو کابرایە دەستی دزیەتی هەیە .

بلاّ دەستم وەبەرخۆم کەوێتەوە ، جابزانە چت لێ دەکەم .

دەبڕۆ خودا بلێم چت بەسەر بێنێ دەستم لە بەرۆکی بەردە .

دەستی شکاوم کاتێک هاتبوو لەماڵ نەبووم دەنا ئابڕووم بۆ نەدەهێشت .

دەستی شەل بە چاوی کوێرەوە بگری !

دەستت گۆج بێ و کوێرایی گری .

دەستت خۆش نەبێ !

دەست و پەنجەت هەڵوەرێ !.

دەستت شکێ !

مالتبەقوری گیری دەست بیزیوە . بوچی هیندە بەساوەساوی !

مندال بووم هیشتا دەستی راست وچەپی خوم نەناسیبوو .

دوژمن لیم لەفیلی بووا دەک مالی بەسی چەپی قوری گیری !

دەست لەپاڵ گفتی پێشینیان دا :

بڕێشکەی جۆ دەخوا و بە سابوون دەستی دەشوا .

بە دەستی بەتاڵ چت بۆ ناکرێ .

بێ دەست شکاندن ، نەقیمی ئەنگوستیلەی دەشکێنێ .

بێ زوڕنا دەنگی لێوە دەهات ، ئێستێ زوڕنایشی بە دەستەوەیە .

پیاو ئەگەر چووە شاری کوێران دەبێ دەستی بەچاوی بگرێ .

پیاوی وشیار ، دەست لە کونێک ناکا دوو جار .

چاو لەدەست ، دەست بەستەیە .

چەپڵە بە دەستێک لێ نادرێ . دەستێک بەتەنێ تەقەی نایە .

خاوەن ماڵ دەستی هەلگرت ، دز دەڵێ حەق دەگەیەنمە جێی خۆی .

خودا ئەم دەستەی ئاتاجی ئەو دەستەی نەکا .

خۆت لە دەست چوی ، خودا عەقڵ بەمنداڵت بدا .

دارێکم بەدەستەوەیە هەر دووک سەری پیسە .

دوو شووتی بەدەستێک هەڵناگیرێ .

دەست پان کەیەوە ، لەپێ دەکەوی .

دەستت بە کەوگیری بێ ، چاوت لە فەقیر بێ .

دەست دەستی دەناسێ .

دەست لە دەست و قووەت لە خودا .

دەست لە گونان درێژترە .

دەست لەهەمبانەی دەرچوو .

دەستم بە کڵاوی خۆم داگرتووە ، با نەیبا .

دەستە چەورەکەی خۆی لەسەرژنمن هەمڵ دەسوێ .

دەستێک حاکم بیبرێ خوێنی نایە .

دەستێک کە شکا جێی خۆی ناگرێتەوە .

دەستێک کە شکا ، درەنگ جێی خۆی دەگرێتەوە .

دەستیک کە شکا ، وەباڵی گەردنە .

دەستێک نەتوانم بیبڕم ماچی دەکەم .

دەستی تەماح درێژە .

دەستی خەڵکە و ماری پێ دەگرێ..
دەستی خۆی نیە و ماری پێ دەگرێ .
دەستیش دەوەشێنێ و هاواریش دەکا .
دەستی کەس پشتی کەس ناخورێنێ !
دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە .
دیزە رەشەی دوو کون لەبن ، دەستە چەورەکەت هەڵسوو بەسەر من .
ردێنیشی پێ دەتاشێ و ئاوێنەشی دەداتە دەست .
زورنا بدەیە دەستناشی ، فوو لە سەرەزلەکەی دەکا .
سەرچۆپی بدەیە دەست سەگ ، گەری هەڵپەرینێ بۆلای سەوەتە نان رادەکێشێ .
قەرز بەقەرز ، دەستەئارداوی .
کەسێک بە منداڵی فێری پلاوخواردنێ نەبووبێ بە گەورەیی لەباتی ئەوەی دەست بۆ زاری بەرێ بۆ کەپۆی دەبا .
کەسێک کە دەستبوکار و دڵ بەیار بێ خوداش لەگەڵیەتی .
کەم دەستی خۆشە ، تۆ رتی ناخۆشە !
گرێ یەک کە بەدەست بکرێتەوە ، مەیدە بە ددان .
ماڵ ئەو ماڵەیە بە دەستی خۆت وەدەستت کەوتبێ .
ماڵی حەڵاڵ لەدەست ناچێ .
مردوو کە مردووە ، شەیتان دەستی لێ هەڵگرتووە .
وەرە دەستمان بەردەینەوە .
هەر ماران بەدەست خەڵکی بگری .
هیچ کەس دەستی کەرەمێ ناگێرێتەوە .
لەچوار پەلان هەر دەستم ساغە
بوپیاوی دەستەوەستان ، چ گەرمین وچ کویستان .
بەدەستەندە شتی مەدە بە خەڵک .
دەست مەگرەوە ولارەمل مەبە تاخوداش بەسەرت دا ، بریژی .
دەستی بەپولوانەوە سووتاوە ،بویە بولای ئەوکارە نایە .

**دەست لەناو مەتەلوکەدا :**

چوومە دیویکی تاریک پربوو لە گوچان،هیچ نەبوو بەدەستەوەی بگرم. ( [illegible] ) "مەتەلوکەی کوردی ؛ ئەییووبیل ١٣٦١ - ل ١١ "

حەواویلکەی حەوا دەکا بەدەست وپی سەما دەکا ،خزمەتی کچی شا دەکا. ([illegible])

دەنگی هەیەو رەنگی نیە ، فری دەدا دەستی نیە . ([illegible])

رەشی سەربەکلاوە ، کاری کوتانە وتیماوە ، لەدەستان خوشبەداماوە . ([illegible])

کانیکەی لەبەندەنی ، گەورەو چکولە دەستی دەکەنی ([illegible])

کانی مەرەی جلقنی، هەموو دەستی دەبەنی . ( [illegible] )

دیویکە گیانی تیدا نینە،بی دەست وقاچ وخوینە،ئەکشی بەچەشنی مار،بی گوشت وبی دەمار. ([illegible])

سووخمەی شال ،تیایەتی دوو پرتەقال،دەستی برد بوو یەکیکیان هاواری کرد؛دایەگیان ، باوکی بوم هات بە گوچان . ([illegible])

کوریکمان بوو بی دەست وپا ، ئەتو بکە شوکری خودا .

([illegible])

دەست لەپاڵ گۆرانیان دا :

مەستووورەی مەستان سێوی سەر دەستان .
چۆن بزانم یار دێ بەخرینگەی بازنەی دەستان

* * *

پێم لێ نێ ئەی پێم لێ نێ پێم لێ نێ بووکە زێنێ
دەستم لەپاڵ دەستی نێ با بچین بۆلای گەرمێنێ

* * *

هەڵمگرن بەچوار دەستان بم بەن بۆکووچەی چاومەستان
شینم بۆ بکەن هەزار دەستان

* * *

ئەولان وئەم لانم کە چوکەلێ دەست لە ملانم کە
خۆ من گیرودەی تۆ بووم حەوالەی لوقمانم کە

* * *

" گۆرانی یاترانەهای کردی، دکتر محمد مکری ، چاپخانە دانش "

یە چەکوسم کەفت ، چوو زەنگم زریا
دەسم لە داوان دووسەکەم بریا
ئەر مەیلت نیە تا دڵنیا بووم
کەم دەس و داوان شێخ و مەلا بووم
ئەگەر مەیلەکەت بیم وەکەسی
دەسم وەداوان ئیمام نەرەسی

" هەر بەڵگەی سەرو، ل ١٥ "

جووتێک شەمامەی نیمرەسم دەیە
دەوری پەرژینە رێی دەسم نیە

" بەڵگەکە ، ل ، ١٩ "

ئەو دەستە نەچیت شەو لەگەردنت
چ فایدە لە دوور نیگا کردنت

" بەڵگەکە ، ل ، ٢٨ "

کورەکەم بکە نووری باوانم
بەشکم بگرێت دەس وەداوانم

" بەڵگەکە ، ل ، ٣٠ "

تووڵەی دەس نیشان ، عەسای دەستمی
من کەسی نیرم تو گشت کەسمی

" بەڵگەکە ، ل ، ٣٢ "

شەلم ، شەکەتم ، ژان داسە قوڵم
کۆرپەکەت لابە ، دەس بخە ملم
دایم هەیتە فیکر دەس وەملانی
تەکت بیە لا کورپەم تلانی
خودا داد لە دەس ئەو نەونەمامە
شەو لە پەژارەی خەو لێم حەرامە

" بەڵگەکە ، ل ، ٤٨ "

خودا داد لەدەس چاورەش چاورەشان
خۆش خوو خۆش لەهجە ،شیرین مەهوەشان

" بەڵگەکە ، ل ، ٥٣ "

ئەگەر مەیلەکەت بدەم وەخوێشان
گلارەم کۆر بۆت دەسم بکێشان
یاران کێ دییە دەردی گرانی
دۆسم نیشتیینە دەس وەزرانی

" بەڵگەکە ، ل ، ٥٨ "

هەر زەوی بەرزە بکەنە بۆسان
شەمامە باریت بۆ دەس دۆسان

" بەڵگەکە ، ل ، ٦١ "

تا قەگولێ بووم بەسەر یالەوە
عاجز بووم لە دەس بای شەماڵەوە

" بەڵگەکە ، ل ، ٨٢ "

یە چە کارێ بو خۆم بەخۆم کردم
دوس ئەخلاقی لە دەس دەرکردم

" بەڵگەکە ، ل ، ٨٣ "

هەستە با بیکەین دوو دەس لەگەردن
نەوەک پەیا بێ لە ناکاو مردن

- قورئانێک بێنە دەستی پێ دادەم
هەتا ڕۆژی مردن مەیلت بەر نادەم
"بەڵگەکە، ل، ٣٧٧"

یاخودا هەر شەو بێ لە ڕۆژ بێزارم
نەوەک سەگ بابێک دەست دا لە کارم
خودا خودامە ڕۆژ ببێ ئـــــاوا
دەستێک بگێرم لەو باخچەی ساوا
دەسرەکەی دەست تافتەی پیـــوازی
خۆ من نەمردووم تۆ ژن دەخوازی
کەس نازانێ بۆچ بێ ڕەنگـــم
گیــرۆدەی دەستــی فەرەنگـــم
بەجێ ماوە شۆخ و شەنگـــم
قەسەم بەو خاڵەی لە ڕووتـــە
فینجانەی دەستــت یاقـووتـــە
سەر هەڵێنە جەرگم سـووتـــا
هەرچەند دەکەم دڵ پیر نابێ
دەستم لە مەمکی گیر نابێ
یـار منداڵە بۆم ژێر نابێ

چاوت ئەستێرەی ڕۆژێ لەگەڵ مانگی دەگەڕێ
برینانم دەرمان کە بەدەستی نیلوفەرێ
سڵاو لە بەژنێ باریک بینایی هەردووچاوم
خۆ من بە دەستی یارێ دیل ویەخسیرکراوم
خودا بۆ خۆی دەزانێ لە عیشقت دا سووتاوم
،بازی بێریان،ژیان وگۆرانی یە–
کانی محەممەدی مامڵێ ،بەرگی یەکەم، محمد
حسن احمد، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٣"
سبحەینی سەر لە بەیانی یار گەشتێکی لەشاردا
لەمن هەر وەک ڕۆژ عەیانە بەڵێنی بەکەس نادا
"بەڵگەکە ،ل، ١٨"

بەو قورئانەی لەسەر دەستم

لەت لەت کرێم لەسەر پۆستـــم
نـانێم مـەیلـی کـۆنـە دۆستـم
"هەر بەڵگەی سـەروو ، ل ٣٦٠"

چاومەستی ئەرێ چاومەستی لەشەوڕاوێت هەڵدەستی
قۆڵی نا ژێر سەرینم لێمدەشکاندبازنەی دەستی
راوەستا لەسەر بیرێ ، لەبەر دەسماڵ هەریرێ
چەندی خۆم مەجبوور دەکرددەستم بۆهەڵ ناگیرێ
" هـەر بەڵگەکە ، ل ، ٣٩ "

سەریکە مەستی نازە و دڵێکە بۆت نـەمـــاوە
دڵم هەقی بەدەستە فتـــوای ســەری دراوە
حەوت ساڵان یاری من بووی بۆچیت نەکرد ماڵ ئاوا ؟
" بـەڵگـەکە ، ل ، ٤٠ "

رەببی ساقی شووشەت کون بـێ
جامی دەستت سـەرەوبـن بـــێ
بەڵکوو فایدێکت بـۆ مـن بێ
" بـەڵگـەکـە ، ل ٥٥٠ "

فەرمووی ماندوومە نـایـــەم
حـازرم بــۆ هـەڵپـەڕکــێ
دەستمان لە دەستی یەک کـرد
وەدەر کەوتین لـە دەرکــێ
" هەربەڵگەی سەرو ،ل،٨٩ "

هەی مەشکێ ، مەشکـێ،مەشکـێ
هـەی ماڵی بابـم مـەشکــێ
هەتیوە دەســت مـەبـزێـــوە
بـازنـە لـە دەستـم دەشکــێ
"هەرئەوبەڵگە ، ل، ٩١ "

دەستی من وەبان کەلامولڵا بـێ
لەتۆشیرین تر مەگەر ئەڵڵا بێ
"هەرئەوبەڵگە ، ل ١١٦٠ "

لـەسـەر بـالاکـــەی بـــەرزت

بــا بمکبــەن تیـــرەبــارا ن
دەستی منـت بـۆ بـە دامـــان
" هەر ئەوبەڵگە ، ل، ١٢١ "

پــەشێـوو دڵ شکـــــاوم
وێڵــی شــاخ و کێـــوانـــم
دەستـــە و ئـەزنـۆدا نیشتووم
مــونتــەزیــری کــاروانـــم
" بەڵگەکە ، ل ، ١٢٧ "

دەست لەپاڵ هەڵبەستی شاعیران دا :

دڵی دا دڵشێکەستی خۆی ، هەڵستا هات بە دەستی خۆی
بە جامێکی ئەڵەستی خۆی وەفایی شێت وشەیدا کــرد

" دیوانی وەفایی ،کتێب فرۆشی سەیدیان، چاپ اول ، ل ، ١٦ "

هەمووی کەوتۆتە ژێر دەستــی فەرەنگان
چیا و چۆلان ئەنۆڕن وەک پڵینگـــان

" گوڵبژێرێک لەدیوانی مــەلا محه محمدی کۆیی ،پیرەمێردی سابلاغ،و حاجی قادری کۆیی،چاپخانەی‌سەیدیان ،ل،١٣٠،مەلامحە ـ ممەدی کۆیی "

تەنبەڵی کاری حیـز و بـێ خێـــرە
دەستی ماندوو لەسەر زگی تێـــرە

"بەڵگەی سەرو ، ل،٤٥،حاجی قادری کۆیی"

وەرە دەستی بخەمە گەردنی بلوورینـــت
تاوەکووسفرە لەداخا بدڕێ ورگی رەقیبت

" دیوانی شێخ رەزا تاڵەبانی،چاپخانەی نەجاح ، بەغدا ، ١٣٤٦ ، ل ، ١٥ "

دەست مایەی عومرم لەدەستم دەرچوو
بەپەنجەی ئەجەل جگەر کون کون بـوو
ناگەڕێتەوە کەسێ لەو دونیـــا
تا لێی بپرسین ئەحواڵی مــــردوو

"سەلام،روباعیات خەیام،چاپی دووەم،سولەیمانی ، ل ٢١ "

بۆیەزۆرپێم خۆشە پیری و خەمیدە قامەتی
چونکە دەستم هەر دەگاتە گۆشەی دامانی‌خۆم

" دیوانی زێوەر ،محمّدعارف ،سولەیمانی، ١٩٥٨ ، ل ، ٣٣ "

ئەی شووشە بنازم بە دڵی خاوێنـــت
تاوم بدرێ بەئاوی خەم تاوێنــــت

دەستم بەرئەدەم لەئارەزووی دووردودرێژ
مەیگێڕ لەوەلا دەستی من و داوێنــــت
"هەزار ،خەیامی هەزار ، ١٩٦٨، ل ٥٠"

ئەگەر بەشینەیی بێ رەنجت هەموو بە بایە
چونکەئەم رۆژە رۆژی سورعەت وکەهروبایــە
ئیش کەن بەدەست وبردی،فورسەتە وەرنەکایە
" دیوانی بێ کەس،حەمەی مەلاکەریم ،١٩٤٨؛
ل ٢٥٠"

دائیم کەلە دەستی جەوری زەمانە بەجەفایە
پەیوەستە بەجەوروئەلەم و دەرد و بەلایــــە
بۆ عاشقی بیچارەیە ئەو عادەتە وایــــــە
بۆیە کە لە گۆشەی غەمی داماوە دلّی مـــن
"دیوانی صافی،چاپی دووهەم ، هەولێـــر
١٩٦٥؛ ل ، ٤٢ "

بۆبادەی مەعنا لەدەموقەولی لەبیبــــان
ساقی ونەی و بەربەتوئامێزی حەبیبــــان
ئەمرۆ وەرە ئەم بەزمەبەکوێرایی رەقیبان
بێ جێ وجیهەت مەمدەنەبەردەستی تەبیبـان
" دیوانی ئەدیب ، هەولێر ،١٩٥٢،ل ٤"

نموونەی دەستی پەروەردگار بـــــــوون
بە دەوری تۆدا گولّی بەهــار بـــوون
" دیوانی پیرەمێرد ،بەغدا ، ١٩٧٠ ،هاوار
ل ، ١٢٤ "

دەست لەناو بەیتەکاندا:

کەڵێکی مەیدان ، بەبرو نەڕە شێر ،
تەردەستو ئازا ، دڕندە و دلێر.

" بەیتی کەڵ وشێر ، ١٣٥٧، نشریە دانشکدە
ادبیات تبریز ، فتاحی قاضی ، ل ٢٥٩، "

ئاغام ئاقڵت پەشۆکاوە ،
یان پەریان دەستیان لە دڵت داوە
دارەلەک بەقوڕێ گیراوە
ئاو زۆرە دەڵێی سێلاوە .

" بەیتی عبداللەخانی موکری ،نشریە دانشکدە
ادبیات تبریز ،٢٥٣٦، فتاحی قاضی ،ل ٤١٧، "

بازنەی ئاوزەنگی دەستی دوورە ویاقووتە و مەرجانە و ،جێ جێ
نەقیمی ئاڵی تێ گیراوە ،
پێ لەهەر جێگایەک بنێ ، گلەکەی دەبێتە موتفەڕک ، دەڵێن
حاجیان لەمەککەی معەززەمیان ڕا هێناوە .

" منظومەکردی ،سعیدومیرسیف الدین بیگ ، قادر
فەتاحی قازی، ٢٥٣٥ ، ل ، ١٧ "

ئەوە مانگ لەمن دەبنەوە بە شەشە ،
خودایە بەمنت ڕەوا دیوە دەستو پەنجە وقالب ، داوتە بەمن
بەشە .

" منظومەکردی شیخ فرخ وخاتون استی ، نشریە
دانشکدە ادبیات تبریز ، ١٣٥١ ،قادر فەتاحی قازی ٢٤

مامۆستا دەستی منت بە دامانە ،
دەمدەیەی یاقووتی عەبدولحەسەن و لەعلی رووممانە ،

" منظومەکردی مهرووفا ،١٣٤٥ ،قادر فەتاحی قازی ٦٩

دەستی منو بێ بەدامانە ،
مەرگم وەک سیخی بریانە
دڵ بۆ سۆ پڕ ئەڵئەمانە

" منظومەکردی شێخ صنعان، دانشکدە ادبیات ،تبریز
فەتاحی قازی، ١٣٤٦ ، ل ، ٥٠ "

